

# من و ئەوان

## لە گفتوگۆدا

نووسینی:

ئەنەس هەرکی

# من و ئەوان لە گفتوگۆدا





- بابەت: ڕوشنبیری گشتی
- نووسینی: ئەنەس هەرکی
- پێداچوونەوە: عبدالرحمن ستار جبار
- بەرگ: ابراهیم صالح
- چاپ: 2020 – هەولێر
- نۆرەی چاپ: یەکەم
- بڵاوکراوەی: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی
- قەبارەی کتێب: 14*21. ١٤٧ لاپەڕ
- شوێنی چاپ: طهران.
- نرخ: ٣٠٠٠

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٢٠٥ )ی ساڵی ٢٠٢٠ دراوەتێ.

وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَىٰ تَنفَعُ الْمُؤْمِنِينَ (الزاريات 55 ).

واتا:بەڵکو تۆ هەمیشە ئامۆژگاریان بکە، چونکە بەڕاستی ئامۆژگاری سوود بەئیمانداران دەگەیەنێت.

# ناوەڕۆك

# پێشەکی

(بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ)

بێگومان ئەوەی لە دنیادا بژی بەدوور نابیَ لە کێشە و گرفت و تێنەگەیشتن لەهەندێک شت و بابەت یان بەهەلە تێگەیشتنی هەندیَ بابەت، ئەوەی لەسەر ئێمەی مرۆڤایەتیە ئەوەیە بگەڕێین و بجەنگین و کۆڵنەدەین بۆ زانین و دەرکەوتنی ڕاستیەکان، ئەوەی لەناو خەڵکادا دەبینین خەڵکی لە زۆر بابەت کێشەی هەیە و یاخود لێی تێناگەن، ئەوەی لەو کتێبەی بەردەستت دایە، هەوڵدراوە گرینگی بە کەمێک لەو بابەتانە بدات کە خەڵکی لێی تێنەگەیشتوون یان کێشەیان لێی هەیە، ئەم کتێبە بەشێوەیەکی جیاواز نوسراوە، بۆ ئەوەی خوێنەری بەڕێزو سەنگین بێزارنەبیَ لە خوێندنەوەی، وە تێگەیشتن لەبابەتەکان ئاسان بێت، لایەنێکی تری ئەم جۆرە نوسینە ئەوەیە، خوێنەر زیاتر سودمەند دەبێت لە چۆنیەتی گفتوگۆ کردن لەگەڵ چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگا، خاڵێکی تری ئەوەیە زۆرێک لەکێشەو گرفتەکان بە ڕاوێژ و پسیارکردن چارەسەر دەبیَ.

الله تعالیَ فەرموویەتی: (وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَىٰ تَنفَعُ الْمُؤْمِنِينَ ( 55 )

(1)

واتا: بەڵکو تۆ هەمیشە ئامۆژگاریان بکە، چونکەبەڕاستی ئامۆژگاری سوود بەئیمانداران دەگەیەنێت.

ئەوەی گرینگە لێرە لەهەر بابەتێکدا ئامۆژگاری و پەندی تێدایە.

وا لە مرۆڤ دەکات کەمتەرخەم نەبێ لە کردنی ئامۆژگاری باش و ئامۆژگاری باشیش وەربگرێت.

داوا لەخودای گەورە دەکەم ئەم کتێبەمان بۆ بکات بە تێشویەک لە قیامەت، نیەتمان بۆ ئەو ساف بێت لەپێناو ئەودا ئەوکارەمان کردبێت، بەهیوام ئەم کتێبە کەمێک لە کتێبخانەی کوردی پێ دەولەمەندبێت و سودی هەبێ بۆ هەموو چین و توێژێکی کۆمەڵگا لەهەر تەمەنێکی جیاوازدا.

**ئەنەس هەرکی**

**٢١/جمادى الآخيرة/١٤٤١**

---

(1) الزاريات

# ژیان

**فێرخواز:** السلام علیکم .

**من:** وعلیکم السلام .

**فێرخواز:** مامۆستا گیان چۆنی؟

**من:** سوپاس بۆ خوا باشم، تۆ چۆنی ؟

**فێرخواز:** منیش باشم سوپاس،

مامۆستا دنیا چیە؟

**من:** دنیا ئەو جیهانەیە یاخود ئەو شوێنەیە کە تۆ و هەموو مرۆڤایەتی تێیدا دەژین .

**فێرخواز:** باشە مامۆستا ئەی ژیان چیە؟

**من:** ژیان ئەو کاتە یان ئەو تەمەنەیە کە مرۆڤایەتی دەیباتەسەر.

**فێرخواز:** مامۆستا پێویستە مرۆڤ چۆن ژیان بەرێ بکات لە دنیادا؟

**من:** بە باشترین شێوە ژیان بەرێ بکات.

**فێرخواز:** واتا چۆن ؟ چۆن بە باشترین شێوە ژیان بەرێ بکات؟

**من:** مانای ئەوژیانە بزانێت کەلەم دنیایەدایە.

**فێرخواز:** چۆن مانای ئەو ژیانە بزانێت؟

**من:** بەگەڕان بەدوای ڕاستیەکاندا.

**فێرخواز:** ڕاستیەکان چین ؟ چۆن بەدوایدا بگەڕێت؟

**من:** بۆ ئەوەی ڕاستیەکانی بۆ دەربکەوێ و بزانێ، کۆمەڵێ پسیارهەن دەبێ بیانکات و بەدوای وەڵامیاندا بگەڕێت.

**فێرخواز:** ئەو پسیارانە چین؟

**من:** بزانێ کە ئەو چیە؟

لەکوێ هاتووە؟

ئێستا لەکوێیە ؟

بەرەوکوێ دەڕوا؟

بۆچی هاتۆتە ئەوشوێنە ؟

ئەو شوێنەی کە لێیەتی کێ دروستی کردوە؟

کێ ئەوی دروست کردوە؟

پێویستە چی بکات ؟

**فێرخواز:** مامۆستا پسیارەکانمان زانی بەڵام کەمێ ئاڵۆزن چۆن بیانزانێت؟

**من:** نەخێر ئاڵۆز نین و زەحمەتنین بۆ کەسانێک کە بە ئاقڵی بیربکەنەوە.

**فێرخواز:** مامۆستا با پێکەوە وەڵامی پسیارەکان بدەینەوە.

**من:** باشە فەرموو .

**فێرخواز:** من کێم ؟

تۆ کێی ؟

ئێمە کێین؟

**من:** من و تۆ و هەموو ئەو کەسانەی دەوروپشتمان پێمان دەگوترێت مرۆڤ کە بە ئەقڵ و زانین لە گیاندارەکانی تر جیادەکرێینەوە.

**فێرخواز:** باشە مامۆستا لە کوێ هاتووین ؟

**من:** مێژووی مرۆڤایەتی درێژە بەڵام ئەوەی گرینگە هەموو مرۆڤایەتی نەوەی کەسێکە کە ئەویش ئادەم علیە سلام [2]، هەموومان لەنەبوونەوە هاتوینەتە بوون.

**فێرخواز:**مامۆستا ئێستا لەکوێین ؟

**من:** ئێستا لە دنیادایین ژیان بەڕێ دەکەین.

**فێرخواز:** مامۆستا گیان بەرەو کوێ دەڕۆین؟

**من:** هەموو مرۆڤێک لە دنیادا تەمەنێکی بۆ دیاری کراوە دوای تەواوکردنی ئەو تەمەنە ئیتر کۆتایی بە ژیانی دنیای دێت و دەمرێت[3]

---

[2](الناس بنو آدم وآدم من تراب) رواه أبو داود والترمذي
واتا:خەڵکی لە نەوەی ئادەمن وە ئادەمیش لە خۆل
[3]كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ(آل عمران 185 )

**فێرخواز:** باشە مامۆستای هەموو ئەوکارانەیکردوە؟

**من:** کامە کار؟

**فێرخواز:** بەدیهێنانی ئێمە، بەدیهێنانی ئەو دنیایە، دیاریکردنی تەمەن بۆ ئێمە، ئایا ئەوشتانە کەسێک رێکی دەخات یان بەشێوەیەکی هەرەمەکیە ؟

**من:** جا کوڕم خۆ پسیارە گرینگەکە لێرەیە!

**فێرخواز:** باشە مامۆستا پێم بڵێ؟

**من:** نەخێر کوڕم دروست بوونی ئێمە و دروست بوونی دنیا و هەموو دروستکراوەکان بەدیهێنەرێکی هەیە و هەرگیز هەرەمەکی نیە.

**فێرخواز:** باشە مامۆستا ئەو بەدیهێنەرە کێیە؟

**من:** ئەو بەدیهێنەرە اللە تعالى یە، بەدیهێنەری ئەرز و ئاسمان، پاک و بێگەردە و تاک و تەنهایە، هەرخۆی ئەم گەردونەی بەدیهێناوە و هەرخۆشی دەتوانێ بەڕێوەی ببات، دەسەڵاتی بەسەر

هەموو شتێکدا هەیە.[4]

**فێرخواز:** باشە تۆ چۆن ئەوت ناسی ؟

**من:** کورم الله تعالی لەرێی نێردراوانی خۆی بەندەکانی ئاگەدارکردۆتەوە، هەموو ئەو زانیاریانەی پێداون کە مرۆڤ پێویستیەتی لە ژیانیدا.

**فێرخواز:** باشە مامۆستا تۆ گوتت لەرێگەی نێردراوانی زانیاری بە ئێمە دەدات، ئەو نێردراوانە کێن و ژمارەیان چەندە و ئێمە دەبێ بەدوای کێ بکەوین؟

**من:** کورم ئەوانە پێغەمبەرانن هەلبژێردراوی الله تعالی، الله تعالی لەهەر گەل و نەتەویەک پێغەمبەرێکی بۆ رەوانەکردون، وە پێغەمبەران هەموویان یەک پەیامیان هەبووە ئەویش پەرستنی الله

---

[4] يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَـــاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَـــاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا(النساء 1)
واتا:ئەی خەلکینە لە خەشم و نارەزایی ئەو پەروەردگارەتان خۆ بپارێزن کە ئێوەی لە تاکە نەفسێک دروست کردووە، هەر لەو نەفسەش هاوسەرەکەی بەدی هێناو لەو دووانە پیاوان و ژنانی زۆری خســـتۆتەوە و بلاوکردەوە، هەروەها لەو خوایە بترســـن کە لە یەکتر داوا دەکەن بەناوهێنانی ئەوەوە، هەول بدەن پەیوەندی خزمایەتیش بپارێزن و (پتەوی بکەن)چونکە بەڕاســـتی خوا (هەمیشـــە و بەردەوام) چاودێرە بەسەرتانەوە.

وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّـــمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِـــتَّةِ أَيَّامٍ(هود 7) واتا: ئەو خوایە زاتێکە ئاسمانەکان و زەوی لە ماوەی شەش رۆژدا دروستکرد.

تعالی یە بە تاکو تەنها دوورلە هاوبەشی دانان، بەڵام ئەوەی جیاوازی هەبووە شەریعەتیان بووە.[5]

**فێرخواز:** باشە ئێمە پێویستە بەدوای کێ بکەوین؟

**من:** ئێمە پێویستە بەدوای دواهەمین پێغەمبەر بکەوین، ئەو ئاین و ڕێبازەی کە ئەوی لەسەرنێردراوە وەربگرین و لەسەری بڕۆین .

**فێرخواز:** باشە مامۆستا ئەو پێغەمبەرە کێیە ؟

**من:** کوڕم ئەو پێغەمبەرە ناوی محمدە(صلی الله علیه وسلم) کە دواهەمین پێغەمبەرە و پەیامی دینی پیرۆزی ئیسلامی پێیە، بۆ هەموو جیهان نێردراوە و پەیوەست نیە بە گەل و نەتەوەیەک، پێویستە هەموو مرۆڤایەتی بەدوای بکەوێت، بۆ بەسەربردنی ژیانێکی باش و دوا ڕۆژێکی باش

**فێرخواز:** مامۆستا دوا ڕۆژ چیە ؟

مەبەستت دوای مردنە؟

---

[5] وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى اللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلَالَةُ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ(النحل 36)
واتا: سوێند بە خوا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووەو پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر، جا هەبوو لەو خەڵکە (کە بیرو هۆش و ژیری خۆی خستەکارو بەشوێن ڕاستیدا دەگەڕا) خوایش هیدایەتی دەدا، هەشیان بوو خۆی شایستەی گومڕایی دەکردو بەسەریدا دەچەسپا، کەوابوو بگەڕێن بەسەر زەویداو سەرنج بدەن، بزانن چۆن بوو سەرەنجامی ئەو کەسانەی بڕوایان بە بەرنامەی ئێمە نەبوو.

**من:** بەڵێ کوڕی خۆم کە الله تعالی ئێمەی دروستکردوە داوای پەرستن و کاری باشەی لە ئێمە کردوە، وەهەروەها ڕێگری لێکردوین لەکاری خراپە، بۆیە لە دوا ڕۆژیشدا لەسەر کردەوە باشەکانی دنیامان پاداشت وەردەگرین، وە ئەگەر بە پێچەوانەشەوە بێت ئەوا سزا دەدرێین، ئەوەش ئەو پەڕی دادپەروەریە.[6]

**فێرخواز:** باشە مامۆستا جگە لە دینی ئیسلام هیچ دینێکی تر ڕێگە پێدراوە؟

**من:** نەخێر تەنها دینی ئیسلام لەلای الله تعالی ڕێگا پێدراوە[7]

**فێرخواز:** باشە مامۆستا لە ئیسلامدا نمونەی دنیا وەکو چیە؟

---

[6] وَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَٰئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا(النساء 124)

واتا:ئەوەش کردەوە چاکەکان ئەنجام بدات نێر بێت یان مێ لەکاتێکدا ئیماندار بێت، جا ئەوانە دەچنە بەهەشـــتەوەو بەقەدەر پەردەی ناوکی خورما ســـتەمیان لێناکرێت

[7] إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الْإِسْـــلَامُ وَمَا اخْتَلَفَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ وَمَن يَكْفُرْ بِآيَاتِ اللَّهِ فَإِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ(آل عمران 19 )

واتا:بەڕاستی دین و ئاینی پەسەند لای خوا تەنها ئاینی ئیسلامە، ئەوانەش کە کتێبە (ئاســـمانیەکانیان) دراوەتێ، جیاوازیان لە نێواندا پەیدا نەبووە مەگەر لە دوای ئەوەی زانســـتی و زانیاری تەواویان بۆ هاتووە (دەربارەی ڕاســـتی محمد (صـــلی الله علیە وسلم) و ئیسلام)، ئەمەش بەهۆی دنیاپەرستی و حەسوودی و ستەم کردنیان لە نێو خۆیان (چونکە ڕازی نەبوون بە پێغەمبەرێک لە غەیری خۆیان)، جا ئەوەی باوەڕی بە فەرمان و ئایەتەکانی خوا نەبێت، ئەوە بێگومان خوا بەخێرایی حســـابی خۆی دەکات لەگەڵیاندا (هەر زوو بەدۆزەخیان دەگەیەنێت)

وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ
(آل عمران 85 )

واتـا:جـائـەوەی بێجگـە لـە ئـاینی ئیســـلام پـەیڕەوی هـەر ئـاینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت، لەقیامەتیشدا لە خەسارەتمەندو زەرەرمەندانە

**من:** کوڕم زۆر نموونەی جوان هەن هەر یەکێکیان بە شێوازێکی جوان باسی دەکات، بەڵام من ڕاموایە نمونەی دنیا:

نموونەی دنیا وەکو ئەوە وایە ئەگەر بە کەسێک بڵێیت من ئێستا تۆ لەو سوپەرمارکێتەدا دادەنێم و دوای ماوەیەک تۆ دەردەهێنم لێرە، لە وانەیە کەمێکێکی تر بێت یان چەند ساڵێکی تر، ئەو مارکێتە شتی باش و خراپی تێدایە، جا هەوڵبدە و هەمیشە لە هەوڵداندا بە و شتی باش کۆبکەوە، چونکە کە دەرم هێنایت بەو شتە دەژی کە لەگەڵ خۆتدا هێناوتە و کۆت کردونەتەوە جا چ چاک یاخود خراپ [8].

**فێرخواز:** واتا ؟

---

[8] نموونەی دنیا لە قورئانی پیروز:
إِنَّمَا مَثَلُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاءٍ أَنزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ النَّاسُ وَالْأَنْعَامُ حَتَّىٰ إِذَا أَخَذَتِ الْأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَازَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَا أَنَّهُمْ قَادِرُونَ عَلَيْهَا أَتَاهَا أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا فَجَعَلْنَاهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِالْأَمْسِ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ(يونس ٢٤ )واتا:بێگومان نموونەی ژیانی ئەم دنیایە، هەر لەو بارانە دەچێت لەئاسمانەوە دامانباراندووە جا بەهۆیەوە ڕووەکی زەوی گەشەدەکات و بەیەکدا چوون (بەرو بوومی خۆی پێشکەش دەکات) لەوخۆراکانەی کەهەم خەلکی و هەم ئاژەلیش لێی دەخۆن، هەتا کاتێک وای لێ دێت زەوی، بەجوانی نەخش و نیگاری خۆی دەردەخات و خۆی دەڕازێنێتەوە، خەلکەکەی وا گومان دەبەن بەڕاستی هەمیشە دەسەلاتداری تەواون بەسەریدا (ئا لەوکاتەدا کەخەلکی خراپ و غافلن و دلیان بەدنیا خۆشەو هەرچی گوناهو تاوانە دەیکەن) ئەوە فەرمانی ئێمەیان بۆ دەردەچێت لەشەودا یان لەڕۆژدا، ئەوسا وەک کشتوکالی درونیەکراوی لێ دەکەین، هەروەکو دوێنێ نەبووبێت، ئابەو شێوەیە ئایەتەکانی خۆمان ڕوون دەکەینەوە بۆ کەسانێک بیر بکەنەوەو تێفکرن (وا دیارە ڕۆژێک دێت پێشکەوتنی زانستی دەگاتە ئاستێکی زۆر باڵا، خەلکی ئەو سەردەمە زۆر غەڕا دەبن، بەلام لەپڕێکدا خوا کۆتایی بەهەموو شتێک دەهێنێت).

ئەگەر دنیا بە سوپەرمارکێتەکە حیساب بکەین خودای گەورە ئێمەی لەو دنیایە داناوە، وە دیاریشی نەکردووە کەی ئێمە لەو دنیایەدا دەردەهێنێت، وە فرمانی پێ کردووین بە کاری چاک و کارە چاکە کانیشی دیاری کردووە، وە رێگری لە کارە خراپەکان کردووە و دیاریشی کردوون کامانەن کارە خراپەکان،

وە دەشزانین ئەو کار و کردەوانەی لە دنیادا لەگەڵ خۆمان دەیان بەین، لە قیامەتدا هەر بەوانە دادگایی دەکرێین و پاداشتمان دەدرێتەوە، بۆیە ئێمە پێویستە کاتەکانمان هەمیشە لە بەندایەتی و کار و کردەوەی باش بە فیرۆ بدەین، چونکە دیار نیە کەی دەردەچین لەم دنیایەدا[9]

**فێرخواز:** ڕاستە مامۆستا زۆر سوپاس بۆ ئەو زانیاریانە.

**من:** سەرکەوتووسەرفرازبی لەدنیا و دواڕۆژتدا.

**فێرخواز:**ئامین مامۆستا.

---

[9]دنیا کەســک و جوانە، وە خودای گەورە ئێوەی لە ناو داناوە و ئێوەی کردووە بە جێنشینی خۆی، وە خودا ی گەورە ئاگادارە بە کاروو کردەوەکانمان(رواە مسلم)
(ابن القیم) لێک چوانـدنێکی هێنـاوەتەوە بەم نموونە قورئـانییە(یونس ٢٤ )،کە دەڵێـت؛خودای گەورە ژیـانی بەوە وەســـف کردووە کەوا خۆی لە چـاوی مرۆڤـدا ئەڕازێنتەوە،مرۆڤیش ئەم ڕازانـدنەوەی بە دڵ ئەبێـت،بۆیە دڵی بۆی دەچێـت و بەدوای دونیا دەکەوێت و دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەوەوە،تەنانەت گەر واش بیر بکاتەوە کەوا دوونیا مولکی ئەوەو دەتوانێت لەسەری زاڵ بێت

# کەسی سەرکەوتوو

**فێرخواز:** السلام علیکم مامۆستا.

**من:** وعلیکم السلام.

**فێرخواز:** مامۆستا چەند پسیارێکم هەیە؟

**من:** فەرموو.

**فێرخواز:** مرۆڤەکان بەچی لەیەکتری جیا دەکرێنەوە؟

**من:** بە بیرۆکە و کردارییان.

**فێرخواز:** ئەی مامۆستا کردارەکان بەچی لە یەکتر جیادەکرێنەوە؟

**من:** بە باشی و سەرکەوتوویان.

**فێرخواز:**ئەی مامۆستا چ کەسێک دەتوانێ ئەو کارانەبکات؟

**من:** کەسی سەرکەوتوو.

**فێرخواز:** باشە مامۆستا، ئایا سەرکەوتن چیە؟

**من:** واتا لە ژیان پڕبەرهەمترین کەسبیت و هیچ شتێک نەتوەستێنێت

**فێرخواز:** باشە مامۆستا بۆچی سەرکەوتن گرینگە بۆ مرۆڤ؟

**من:** کوڕم مرۆڤ ئەو تەمەنەی بۆی دیاری کراوە بەهەر جۆرێک

بێت لە جۆرەکان بەرێیدەکات،

بەخراپی بێت یان بە باشی!

بە غەمباری بێت یان دڵخۆشی!

بەس ئەوە گرینگە لە ژیانیدا پێگەو سەنگی خۆی هەبێت، هەست بکات لە ژیاندایە و بێ هودە دروستنەکراوە، پێویستە کەسێکی بەرهەمدار بێت!

**فێرخواز:**باشە مامۆستا چۆن وابم؟

چۆن وابکەم ببم بە کەسێکی سەرکەوتوو؟

بەرهەمم هەبێ لەژیانادا وە نەبم بە کەسێکی دۆڕاو؟

**من:** باشە کورِم چەند ئامۆژگاریەکت دەکەم باش گوێیان لێبگرە

**فێرخواز:** باشە مامۆستا فەرموو

**من: یەکەم**

تێبگە لەمانای ژیان: ژیان چیە؟

بۆچی دەژی؟

بۆچی دروسکراوی؟

کێ دروستی کردووی وە بۆ کوێ دەچیت ؟

تا تۆ لێیان تێنەگەیت سەرکەووتن زۆر قورِس دەبێت .

**دووەم:**

ئامانجت هەبێ لەژیان: کە لە مانای ژیان تێگەیشتی ئینجا پێویستە بەپێی تێگەیشتنەکەت ئامانجت هەبێ و بۆ ئامانجەکانت هەولبدەی.[10]

**سێیەم:**

با جیاوازی لەنێوان تۆی واقیعی و تۆی نموونەیدا کەم بێ، لە خەیاڵی مرۆڤەکاندا هەمیشە کەسێکی نموونەیی هەیە، کە هەمیشە هیوا و ئاواتیانە لە ڕاستیشدا ئەو کەسە نموونەییە بن، بەڵام ئەگەر بێت و ئەو کەسە نموونەیەی کە لە خەیاڵتدایە جیاوازیەکی زۆری هەبێت لەگەڵ ئێستای ژیانی تۆدا، ئەوا سەرکەوتن زۆر قورسدەبێ، چونکە ئەو کردارانەی توانات هەیە بیانکەی لە خەیاڵتدا نین!

وە ئەوکارانەی کە لە خەیاڵتدان ناتوانی بیانکەی یاخود ئەگەری گەیشتنت پێیان زۆر کەمە!

ئەوا بەم شێوەیە کەسێکی بێ بەرهەم و دۆڕاو دەبی.[11]

**چوارەم:**

---

[10] لە بەشی ئامانج زیاتر باسکراوە

[11] لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا(البقرة 286 )

واتا: خوای گەورە ئەرک ناخاتە سەر هیچ کەسێک مەگەر بە قەدەر توانایی خۆی نەبێت.

کەواتە ئێمەش دەبێ بە ئەرکێکی وا هەلسین کا لە تواناماندابێت

شتێک لە ئیرادەی تۆدا نەبێ قسەی لەسەرمەکە و مێشکی خۆتی پێوە ماندوو مەکە، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا کەسەکان سەرکەوتنی خۆیان بەشتانێکەوە بەستۆتەوە کە لە ئیرادە و توانای ئەواندا نیە، هەمیشە قسە و کار لەسەر ئەوشتانە بکە کە دەتوانی کاریگەریەکی قوڵت لەسەر هەبێ و توانایی گۆڕینیت هەبێت، خراپەکان باش بکەیت و هەوڵی بەردەوامی باشەکان بدەیت.

**پێنجەم:**

خاوەن سەربەخۆیی خۆت بە و خۆت بڕیارە گرینگەکانی ژیانت بدە و لەژێر دەستی کەسدا مەبە، ئەوەی پێویستە بۆ مرۆڤی تێگەیشتوو پێگەیشتووی ئاقڵ ئەوەیە خاوەن سەربەخۆی خۆی بێت، خۆی چارەنوسی ژیانی خۆی دیاری بکات و لەژێر دەستی کەسانیتردا نەبێ، کۆیلەی بن دەستی هیچ کەس و بیرۆکە و ڕێبازێ نەبێ، جگە لە ڕێبازی گرینگ و گەوهەر (ئاینی ئیسلام) کە مرۆڤی لە کۆیلایەتی ڕزگارکرد.[12]

**شەشەم:**

هەمیشە لەکارە گرینگەکانت ڕاوێژ بە کەسی دڵسۆز و شارەزا بکە،

---

[12] بەداخەوە ئەوەی دەی بینین لە جیهاندا سیستەمی کویلایەتی پەیڕەو دەکرێ، لە خەلکیان ئالوز کردوە،خەلکی وا دەزانێ پەیداکردنی خواردنێکی ڕۆژانە ئازادی بۆ تاکە کەس فەراهەم دێنێ، بەلام لە ڕاستیدا بەم شێوەیەی ئیستا بەدەست نایێ.

مرۆڤ لە بنچینەدا کەسێکی بێ زانستە، بەهەوڵ و کۆششی خۆی فێردەبێ، یەکێک لەوانە پسیار و ڕاوێژکردنە بە کەسانی شارەزا و دڵسۆز، بۆ ئەوەی ئەو ئەزمونە و ئەو وانانەی لەژیانیاندا بە ماوەیەکی درێژ فێربوونە بە ئاسانی پێتی ببەخشن، بەڵام پێویستە هەردوو مەرجەکەی تێدابێت زانا و دڵسۆز بێت، ئەگەر وانەبێت لەوانەیە بە پێچەوانەوە زیانی بۆتۆ هەبێت و لەجیاتی سەرکەوتن ڕوخانت پێشکەش بکات[13].

**حەوتەم:**

هەمیشە هەوڵی بیرۆکەی نوێ بدە، وە بیرۆکەت هەبێ بۆ هەمو شتێک، الله تعالى کە ئەقڵی بە مرۆڤ بەخشیوە، پێویستە هەمیشە مرۆڤ بیرۆکە و داهێنانی هەبێت لە دنیادا، کە بەو بیرۆکە

---

[13] فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ(آل عمران١٥٩ ) واتا: کەوابوو (ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) بەهۆی ڕەحمەتی خواوەیە تۆ نەرم و هێمن بویت لەگەڵیاندا، خۆ ئەگەر تورەو قسە ڕەق و بێ بەزەیی بوویتایە، ئەوە هەموو لە دەورت بڵاوەیان دەکرد، کەواتە چاوپۆشیان لێبکە و لێیان ببورەو داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکە، لە کارو پێشهاتدا پرس و ڕایان پێ بکە، (دوای مەشورەت و پرس و ڕا) ئەگەر بڕیارتدا (کارێک ئەنجام بدەیت، ئەنجامی بدەو) پشت بەخوا ببەستە، چونکە بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆشدەوێت کە پشتی پێدەبەستن
وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ(الشورى 38)
واتا:ئەوانەش بەدەم بانگەوازی پەروەردگاریانەوە چوون و نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام داوە و کارو باریان هەردەم بە مەشورەت و ڕاپرسی و ڕاوێژکاریە و لەو ڕزق و ڕۆزیەی کە پێمان داون، دەبەخشن...

و داهێنانانە ژیان بۆ خۆی و کەسانی تر ئاسان بکات، وە بیکات بە تێشویەک بۆ قیامەتی خۆی.

**هەشتەم:**

هەرگیز رێگە نەدەی خەمو پەژارە کۆلی ژیانت لێ قورس بکەن، وات لێبکەن لەسەرکەوتنەکان دووربی، هەر کەسێک بەهەر ئەندازەیەک کەم تا زۆر خەم و پەژارە یەخەیان پێ دەگرێت، ئەوەش شتێکی سروشتیە، بەڵام ئەوەی نا سروشتیە ئەویە کە ئەو خەم و پەژارەیە لە سنوری ئاسایی خۆی تێپەڕ بکات و کاریگەریەکی نەرێنی زۆر خراپی لەسەر جێ بهێلێت، وە واتلێبکات گۆشەگیربی و ژیان لەگەڵ خەمدا بەرێ بکەیت، وە لە سەرکەوتنەکان دوربکەویتەوە.[14]

**نۆیەم:**

بەکەم رازی مەبە و هەوڵی زیاتر بدە، مەبەست لێرە زیاتر لەکاری

---

[14] قُلْنَا اهْبِطُوا مِنْهَا جَمِيعًا فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ(البقرة 38 )
واتا:ئنجا وتمان: هەمووتان دەبێ دابەزن (بۆ سـەر زەوی) جا ئەگەر هەرکاتێك لە لایەن منەوە رێنومایيتان بۆهات، هەرکەس شـوێن رێنوومايی من بکەوێت، ئەوە نە ترس و بیمیان لەسەر دەبێت، نە غەمگین و دلتەنگ دەبن.
وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ(آل عمران139 )
واتا:(ئەی ئیمانداران) کۆڵ مەدەن و ساردمەبنەوە و خەفەت مەخۆن، چونکە هەر ئێوە سـەربەرزو سـەرفرازو سـەرکەوتووترن ئەگەر ئیمانداری چاک و راسـت و دروست بن.

چاکە و خزمەتی دین و خەڵکی دایە، مرۆڤ پێویستە لەسەری تا پێی بکرێت و لەتوانایدا هەبێت هەوڵ و کۆششی خۆی بدات و لە هەربابەتێک سودبەخشبێ، لە پەرستن، زانست، یارمەتیدان، هتد...

**دەیەم:**

لەخۆت تێبگە، بزانە تۆ چیت و لە چ ژینگەیەک دەژی و چیت دەوێ، مرۆڤ پێویستە لەخودی خۆی و لە تواناکانی خۆی تێبگات، ئینجا بزانێ چی دەوێت، دەیەوێ چیبکات لەو ژیانە بۆ ئەوەی زیاتر پێش چاوی ڕۆشنبێ.

**یازدەیەم:**

هەمیشە هەست بە بەرپسیارەتی بکە، هەرکاتێک هەستت بە بەرپسیارەتی کرد لە سەدا پەنجای سەرکەوتنەکانت بەدەست هێناوە، مرۆڤ هەوڵێکی زۆر دەدا کاتێک دەزانێ بەرپسیارەتی ئەوکارە لەسەر ملیەتی، دایک ببین کاتێ منداڵەکانی بەخێودەکات، چەند بە میهرەبانی و جوانی بەخێویان دەکات، وە باوکیش ببینن کاتێک ئارەقی نێوچاوانی دلۆپ دلۆپ بەردەبێتەوە و ڕاناوەستێت بو پەیداکردنی نان بۆ خێزان و جگەرگۆشەکانی، ئەوانە بۆچی وادەکەن ؟

چۆن ماندوو نابن؟

بۆچی رۆژێک کەمتەرخەمی ناکەن ؟

چونکە ئەوان هەست بە بەرپسیارەتی دەکەن

بەرانبەر کار و ئەرکەکەیان.

**دوازدەیەم:**

هەمیشە بە گەشبینی لە ژیان بروانە، واهەست بکە هەرچی ڕوبدات لە قازانجی تۆیە، مرۆڤ پێویستە هەمیشە گەشبین بێت بۆ داهاتوو، هەمیشە واهەستبکات و باوەڕێکی تەواوی هەبێت کە الله تعالی هەرچیەک باش و بەسود بێت لەخێری ئەودا دەیهێنێت، بۆ باشترکردن و خۆشترکردنی ژیانی ئەودەبێت.

**سێزدەیەم:**

هەوڵی فێربوون بدە، هەرگیز لە هەوڵدان ماندوو نەبی، لەهەر فێربوونێکدا هەنگاوێک لەسەرکەوتنەکان نزیک دەبیتەوە، بە زانست و زانیاری و فێربوون دەبی بە کەسێکی سەرکەوتوو.[15]

---

[15] فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ وَلَا تَعْجَلْ بِالْقُرْآنِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰ إِلَيْكَ وَحْيُهُ وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا(طه 114 )واتا:خوای گەورە زۆر پایە بەرزو بلندە و پاشـای بە حەق و ڕاسـتەقینەیە، (ئەی محمد صـلی الله علیه وسـلم) نەکەیت لە خوێندنی قورئاندا پەلە بکەیت: لە پێش ئەوەی وەحی و نیگای ئەو قورئانە تەواو ببێت بۆ لای تۆ (چونکە ئێمە نایەڵین فەرامۆشی بکەیت) نزا بکە و بڵێ: پەروەردگارا، بەردەوام زانست و زانیاری زۆرترو زیاترم پێ ببەخشە.
عن أنس بْنِ مَالِكٍ قَالَ :عن النبيّ صلّى اللهُ عليهِ وسلّم أنه قالَ : ( طَلَبُ العِلْمِ فَرِيضَةٌ عَلَىٰ كُلّ مُسْلِمٍ ) . رواه ابن ماجه ( 224 )
واتا:ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێت :پێغەمبەر صـلی الله علیه وسـلم فەرمویەتی : داواکردنی زانست ئەرکە لەسەر هەموو موسڵمانێک.

**چواردەیەم:**

بەدوای کەم و کوری خۆتدابگەڕێ و وازلەخەڵک بهێنە، هیچ کەسێک نیە لە ژیانی ئەمرۆماندا بێ کەم و کوری نەبێت، بۆیە مرۆڤ پێویستە هەوڵی باشترکردنی خۆی بدات سەرەتا، دواتر بەپێی تواناکانی هەوڵی ئەوە بدات کەسانی دەورووبەری باشتربکات.

**پازدەیەم:**

چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەکان بزانە، چونکە کاردانەوەکانی تۆیە کە دەرئەنجامەکەی دیاریدەکات، کێشە و گرفتەکان ڕۆژانە بەرۆکی ئێمە دەگرن و ڕەنگە هەندێک جار خۆ لادان لە کێشەکان قورسبێت، بۆیە پێویستە بەهەر شێوازێک بێت لە شێوازەکان کاردانەوەمان هەبێت، جا ئەنجامی دوای کێشەکان بە کاردانەوەکانمان بەستراوەتەوە، بۆیە کاردانەوەکانمان بڕیاری کۆتایی دەدەن.

کورم بەو ڕێگایەنە دەبیت بەکەسێکی سەرکەتوو لە ژیاندا.

**فێرخواز:** زۆرسوپاس مامۆستا.

**من:** بەس ئەوە لەبیرنەکەی پێویستە ژیانی دنیات لە خزمەتی دوارۆژدا بێت.

---

ابن قیم هەر کەس داوای زانستی شەرعی بکات بۆ ئەوەی ئیسلام سەربخا،پلەی لای خوا پاش پێغەمبەراتییە. (مفتاح دار السعادة)(121)

**فێرخواز**:باشە مامۆستا خودا پاداشتت بداتەوە.

**من**: سەرکەوتووبیت.

# ئامانج

**هاوڕێ:** السلام عليكم.

**من:** وعليكم السلام.

**هاوڕێ:** چۆنی؟

**من:** الحمد لله زۆر باشم، تۆ چۆنی؟

**هاوڕێ:** هیچ باش نیم!

**من:** بۆچی خۆ هیچ نەبووە؟

**هاوڕێ:** نەخێر هیچ نەبووە بەس وەکو ئەوە وایە کە هەموو شتێک بوبێت.

**من:** دەبلێ بزانم چیە؟

**هاوڕێ:** خەڵکی شتانێک دەڵێن کە من نایزانم و لێشی تێناگەم.

**من:** وەکو چی؟

**هاوڕێ:** وەکو زۆر شت.

**من:** بۆ نموونە چ شتێک ؟

**هاوڕێ:** بۆ نموونە ئامانج.

**من:** واتا چی ؟

**هاوڕێ:** واتا هەبوونی ئامانج لەژیان.

**من:** اها، ئێ جا ئەوە کەی کێشەیە.

**هاوڕێ:** چۆن کێشە نیە، بۆمن کێشەیە نازانم چیە؟

بۆچی گرینگە؟

**من:** باشە.

**هاوڕێ:** دەتوانی پێم بلێیت کە چیە؟

**من:** بەڵێ بە دلنیاییەوە.

**هاوڕێ:** چیە؟

**من:** هاوڕێ هەبوونی ئامانج لەژیاندا مانای ژیانت پێ دەدات، وە هەبوونی ئامانج وزە و سەرکەوتنت پێ دەدات،

نەبوونی ئامانج لەژیاندا واتا ژیانکردنێکی بێ مانا، بۆیە هەبوونی ئامانج گرینگە.

**هاوڕێ:** باشە ئەو ئامانجە چیە کە گرینگە؟

**من:** هاوڕێ ئامانج جۆری هەیە و گرینگ و گرینگترینی هەیە.

**هاوڕێ:** باشە.

**من:** مرۆڤ پێویستە ئامانجێکی گەورەی هەبێت وە هەموو ئامانجەکانیتری لەخزمەتی ئەویاندابێ.

**هاورێ**: باشە.

**من**: بۆ زانینی ئەو هۆکارەش پێویستە هۆکاری دروستبوونی مرۆڤ و مرۆڤایەتی بزانین.

**هاورێ**: باشە ئەو هۆکارە چیە ؟

چۆن بیدۆزینەوە؟

**من**: زۆر ئاسانە هاورێ زۆر ئاسان،

ئەگەر سەیری قورئان بکەین دەبینین الله تعالى فەرموویەتی(وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)[16]

واتا:بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووەتەنها بۆ ئەوەنەبێت کەمن بپەرستن و فەرمانبەردارم بن.

کەواتە ئامانجی دروستبوونمان بۆ بەندایەتیە.

**هاورێ**: باشە

**من**:ئەگەهاتوو ئێمەش جگە لەبەندایەتی الله تعالى هیچ ئامانجێکی تری سەرەکیمان هەبێت ئەوا دۆڕاوین.

**هاورێ**: کەواتە ئامانجی ئێمە دەستکەوتنی پارە و کار و ڤێلا نیە؟

**من**: سەیرکە هاورێ، پێویستە هاوسەنگیەک ڕابگرین لەنێوان ئەوانەدا، زۆر لە خەڵکی هەڵە تێگەیشتوون.

---

[16]الزاريات 56

**هاوڕێ**: بەڵێ.

**من**: وتمان پێویستە ئامانجە بچووکەکانمان لەخزمەت ئامانجە گەورەکانماندا بێت.

**هاوڕێ**: وایە.

**من**: هەرکارێک بکەی زیانی بۆ ئامانجە گەورەکەت نەبێ و لەهەمانکاتدا سودی هەبێ ئەوا بیکە.

**هاوڕێ**: باشە.

**من**: پارە پەیدا بکە بۆئەوەی دیاری بۆدایکت بکڕی

مندالەکانتی پێ دلخۆشبکەی!

ئاوڕ لە هەژاران بدەیتەوە!

**هاوڕێ**: باشە.

**من**: فێری خوێندنەوە ببە، نەک بۆشتی بێمانا بەڵکو بۆ شتێک سودی بۆ دنیا و دوارۆژت هەبێ.

**هاوڕێ**: وایە.

**من**: هاوڕێ ئەوەیە ئامانج لەژیان، هەمیشە خزمەتی ئامانجەگەورەکەت بکە!

**هاوڕێ**: زۆر سوپاس بۆتۆ، ئێستا زانیم مانای بوونم چیە و لە کوێ هاتووم و لەکوێم و دەچم بۆ کوێ.

**من**: خودا ئامانجدارت بکات هاوڕێ.

**هاوڕێ**:ئامین دووبارە دەست خۆش.

**ڕونکردنەوە:**

لێرە کە باسی ئامانج کراوە، زیاتر تیشک خراوەتە سەر ئامانجی سەرەکی مرۆڤ، کە پەیوەندیدارە بە دوارۆژی ئەو، بەڵام ئەوەی لێرەدا مەبەستمە بڵێم ئەوەیە کە مرۆڤ ئامانجی سەرەکی دیاری بکات، کە ئەوئامانجەش لای ئێمەی موسڵمان پەرستنی الله تعالی یە، ئەگەر هەرکارێکی تر بکەی موژدەی باشەی لەسەر بێت، وە ئەگەر نیەتی پاکت هەبێ ڕاستەوخۆ خزمەت بە ئامانجە گەورەکە دەگەیێنێت، بۆ نموونە ئامانجی بوون بە بانگخواز، بوون بە دکتۆر، بوون بە هەر شتێکی تر کە بتەوێ خزمەت بە خەلک و موسڵمانان بکەی ئەوا خزمەت بە ئامانجە گەورەکەت دەگەیێنێت، بەڵام لێرەشدا هەبوونی ئامانج گرینگە، ئەگەر ئامانجت بانگخوازی نەبێت پێیناگەی، ئامانجت دکتۆری نەبێت پێیناگەی، ئامانجت لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز نەبێ لەبەری ناکەی، بێ ئامانجی لە ژیاندا

وا پێکدەچوێنن بە وەی کەسێک لەبیاباندایە، ئامانجی هیچ ئاراستەیەک نیە، نازانێ بو کوێ ڕێبکات، گەیشتنی ئەو بەشوێنێک زۆر قورس دەبێت، بەڵام ئەگەر ئاراستەکەی زانراو بێ زۆر بەئاسانی ڕێ بۆ ئەولایە دەگرێتە بەر و دەگاتە شوێنی مەبەست، یاخود کەشتیەک لەناو دەریا دابێ، وە بە ئاراستەی با بجولێت ، ئەگەر ئامانجی دیاریکراو نەبێت، ئەوا بە هەر ساتێک بەرەو ئاراستەیەکی دەبات، بەڵام ئەگەر ئاڕاستەی دیاریکراوبێت ئەوا لە هەندێ کاتدا ڕەشماڵەکانی بلند دەکات و لە هەندی کاتدا دەیهێنیتەخوارەوە، تابگات بەشوێنی مەبەست.

# ئەشق

**ئاشق:**ئای ئەشق دەردێکی گرانە.

**من:**ئەشق دەرد نیە!

**ئاشق:** چۆن دەزانی ؟

**من:** چونکە تۆ دەبینم.

**ئاشق:** ناخم ڕوخاوە ئاگام لە ڕوخسارم نیە چیم لێهاتوە؟

**من:** هیچ!تەنها پێکەنینێکی دەستکرد و پاشماوەی فرمێسکی شەوت لە ڕوخسارا دەبینم!

**ئاشق:** چیبکەم؟

**من:** لەبیربکە!

**ئاشق:** چی لەبیربکەم؟

**من:** هەموو ئەو هۆکارانە وایان کرد ئاشق بی!

**ئاشق:** چی دیکەش؟

**من:** ئاشقەکەشت!

**ئاشق:**ئەشقی یەکەم لەبیرناکرێ!

**من:** کێ ئەوەی گوت؟

**ئاشق:**خەڵکی!

**من:** وتم لە بیریان بکە!

**ئاشق:** چۆن واتا چی؟

**من:**خەڵکی هۆکارێکە لە هۆکارەکان!

**ئاشق:** اهم، ناتوانم بێ ئەو بژیم!

**من:** بۆ ئێستا زیندووی؟

**ئاشق:** دوودڵم!

**من:** دەتوانی بەبێ هەموو کەسێک بژی بەڵام به هەبوونی هەندێک کەس ژیان جوانترە.

**ئاشق:** اهم.

**من:** بەدوای کەسانێکدا بگەرێ ژیانت بۆ جوان بکەن، نەک ناشرین.

**ئاشق:** ئەو کەسانە کێن؟

**من:** ئەوانە ئەو کەسانەن بە گوفتارێکت لێت ڕازی نابن، وە بە گوفتارێکت لێت زویر نابن.

**ئاشق:** باشە.

**من:**واقیعی ژیان دەزانن، وە واقیعی تۆش، ڕازیکردنی پەروەردەگاریان

لاگرینگە لە هەموو شتێک، کە بەشێکی رازیبوونی پەروەردەگاریان پەیوەستە بەتۆوە.

**ئاشق:** باشە.

**من:**تۆی دەوێ بۆ ژیان، هەموو ژیانیشی بۆتۆ دەوێ!

بە وتەکانی ئارامت دەکاتەوە، نەک بە وتەی خەڵکی ئازارتبدات.

بیر و باوەڕی تۆ دەکاتە گۆشەنیگا تێیدا سەیری دنیا دەکات.

تۆی دەوێ نەک ماڵ و سامانی دنیا.

**ئاشق:** ئەوانەی تۆ باسی دەکەی لە ئەودا نیە!

**من:** ئەی چی؟

**ئاشق:** لەوەتەی هەیە هەرخەمی داوەپێم!

**من:** ئەی ئاشقی چی بووی؟

**ئاشق:** جوانی!

**من:** هەست ناکەی هەڵەی؟

**ئاشق:** لە ئێستادا بەڵێ.

**من:** دەتوانی بێ ئەو بژی؟

**ئاشق:** بەڵێ.

**من :** چۆن ؟

**ئاشق:** هەموو ئەو شتانەی پێویستن بۆ ژیان هەمە جگە لە

خەمەکانی ئەو!

**من:** واتا باشتر دەژی؟

**ئاشق:** بەهیوام.

**من:** ئەشق فێرە چی کردی ؟

**ئاشق:** فێری ئەوەی کردم کە ئاشق نەبم!

فێری کردم ئەگەر ئاشقیش بم دەتوانم وازبێنم!

فێریکردم نەخەوتنی شەو واتا چی.

گریانی بێ ئەنجام واتا چی.

ڕۆیشتنێکی بێ ئامانج واتا چی.

فێری کردم زۆربەی بەلێنەکان دەشکێندرێن!

فێری کردم  لەمەو بەدوا پارویەکی بچوک نەبم هەموو کەسێ توانای قوتدانمی هەبێت!

**من:** ئاشقی ئێستا؟

**ئاشق:** ئاشق بووم.

# بەشی دووەم

**ئاشقی پێشوو:** السلام علیکم.

**من:** وعلیکم السلام.

**ئاشقی پێشوو:** چۆنی؟

**من:** باشم، تۆ چۆنی؟

**ئاشقی پێشوو:** زۆر باشم.

**من:** ڕوخسارت دەگەشێتەوە.

**ئاشقی پێشوو:**بەڵێ.

**من:** هۆکاری چیە؟

**ئاشقی پێشوو:** هۆکاری دڵ خۆشیم دۆزیوەتەوە!

**من:** چۆن؟

**ئاشقی پێشوو:**شەوی ڕابردوو زوو نوستم.

**من:** ئێ؟

**ئاشقی پێشوو:**ئەمڕۆ بەیانی لەگەڵ دەنگی بانگ بەخەبەرم هاتم، بڕیارم دا بچم بۆ مزگەوت.

**من:** ئێ؟

**ئاشقی پێشوو:** دوای کردنی نوێژی بەیانی بە کۆمەڵ، هەستم بە دەرونێکی ئارام کرد، وەک ئەوە وابوو هەموو ئەندامەکانی جەستەم نوێ ببنەوە.

**من:** ئیمانداران خۆشەویستی پەروەردەگاریان لا لە هەموو شتێک گرینگ ترە.

(وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ وَلَوْ يَرَى الَّذِينَ ظَلَمُوا إِذْ يَرَوْنَ الْعَذَابَ أَنَّ الْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعَذَابِ)[17]

واتا: (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە ئاشکرایانەدا) هەندێك کەس هەیە لەجیاتی ئەوەی خواپەرست بێت، شتانی تر دادەتاشێت بۆ خۆی و (شوێن ڕێنموویەکانی خوا ناکەوێت و) خۆشەویستی و سۆزی دەدات بەو بت و بەرنامۆلکەو تووڵە ڕێگەیانە و خۆشی دەوێن، وەك چۆن ئیمانداران خوایان خۆش دەوێت، بەڵام ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە زۆر زیاتر خوایان خۆش دەوێت (هەر بەراورد ناکرێت) جا ئەوانەی کە ستەمیان کردووە گەر دەیانزانی لە کاتێکدا کە بەچاوی خۆیان ڕووبەڕووی ئەو سزایە دەبنەوە، کە بەڕاستی

[17] البقرة 165

بۆیان دەردەکەوێت کە هێزو تواناو دەسەڵات هەر هەمووی بە دەست خوایە و دڵنیا دەبوون کە ئەو خوایە سزاکەی زۆر بە ئازارە (بۆ ستەمکاران).

هەوڵی خۆشویستنی الله تعالى بدەخۆشەویستی خوی دەخاتە دڵەوە وە تۆش دەخاتە دڵی ئیماندارانەوە.

**ئاشقی پێشوو:** الحمد لله کە الله تعالى هیدایەتی داین

# بەشی سێیەم

**هاوڕێ:** السلام علیکم.

**من:** وعلیکم السلام.

**هاوڕێ:** باشە هاوڕێ پسیارێک؟

**من:** فەرموو گوڵی من.

**هاوڕێ:** تۆ گوتت کە ئەشق دەرد نیە؟

**من:**بەڵێ.

**هاوڕێ:** باشە بێجگە لە دیتنی من چی دیکەش وای کرد وا بڵێی؟

**من:** بۆچی دەپرسی؟

**هاوڕێ:** پسیارێکە لە مێشکمدا هەیە.

**من:** هاوڕێ.

**هاوڕێ:** بەڵێ.

**من:** لە ژیاندا چەندەها دەرد و بەڵا و ناخۆشی هەن، وە بۆ هەر دەردێک دەرمانێک هەیە و چارەسەری خۆی هەیە، جا ئەو چارەسەریە قورس بێت یاخود ئاسان، لێرە بێت یاخود لەهەر

شوێنێکی تر، ئەوەی من لە ئاشاقان تێگەیشتبم ئەشق دەرمانی نیە !

**هاوڕێ:** باشە بۆ نیەتی ؟

**من:** هەر دەردێک دەبێ بزاندرێت هوکاری چیە بۆ ئەوەی ئەو دەرمانە کار لەو هۆکارە بکات، بەڵام ئەشق هۆکارەکەی هەستێکی ناوەکی نادیارە دڵ و دەرونی مرۆڤی داگیر کردوە، کردویەتی بە دیل بەدستی خەیاڵەوە، لە ژیانی واقیع دوری دەخاتەوە و گیرۆدەی تەنیایی دەکات، تاکە دڵ خۆشی ئەو چەند چرکەیەکی خەونی شەو دەبێت، نازانین ئەشق بەچ شتێک ببەستینەوە، بیدەینە پاڵ چ شتێک، چی لەبارەوە بڵێین، ئەوەی من بیزانم هەرکەس ئاشق بوو ژیانی دەکەوێتە نێوان دووڕیانێکی مەترسیدار! دڵ خۆش دەبێ و غەمبار دەبێ !

دەگریێ و پێدەکەنێ !

هیوای هەیە و دەترسێ !

پێی دەگات و دوورە لێی !

بێدەنگ دەبێ و هاوار دەکا !

لە گەنجیدا پیرە و لە پیریدا گەنجە!

ئیتر نازانین بە ئەشق بڵێین چی؟

**هاوڕێ:** اهم وایە.

ئامۆژگاریت چیە بۆ ئەوانەی دەیانەوێ ئاشق بن؟

**من:** ئاشق نەبن!

**هاوڕێ:** تاکەی؟

**من:**تا ئەوکاتەی دڵنیادەبێتەوە پێیدەگەن

**هاوڕێ:** واتا؟

**من:** واتا با بۆ دوای هاوسەرگیری بێت ئاشق بوون.

**هاوڕێ:** ڕاستە هاوڕێ زۆر سوپاس.

**من:** سوپاس داربی.

# بەشی چوارەم

**هاوڕێ:**السلام علیکم هاوڕێ.

**من:** وعلیکم السلام.

**هاوڕێ:** بیرم لە شێتێک دەکردەوە.

**من:** چیە  هاوڕێ ئەو شتە؟

**هاوڕێ:** بۆچی هەرکەسێ ئاشق بوو ژیانی دەکەوێتە نێوان دوو ڕێیانێکی مەترسیدار؟

**من:** لەبەر دوو هۆکار.

**هاوڕێ:** ئەوهۆکارانە چین؟

**من:**یەکەم: ئاشق بوونیان!

دووەم: ئەوکارانەی کە لەکاتی ئاشقبوون دەیکەن.

**هاوڕێ:** ئەوکارانە چین، وە چ کاریگەریان هەیە؟

**من:** ئاشق چەند وێرانە ئاشقەکان وێرانتری دەکەن.

**هاوڕێ:** واتا چی ؟

**من:** کاتێک ئاشق بۆ ئاشق قسەدەکا خراپتری دەکات.

**هاوڕێ:** باشە.

**من:**ئاشق چەند خراپە ڕۆمانەکان خراپتری دەکەن!

ئاشق چەند بێ هیوایە شیعرەکا بێ هیواتری دەکەن!

ئاشق چەند دەگری گۆرانیەکان گریانی زیاتر دەکەن!

ئاشق چەند دڵ ناسکە چیرۆکەکان دڵناسکتری دەکەن!

ئاشق چەند گۆشەگیرە یادگاریەکان گۆشەگیرتری دەکەن!

ئاشق چەند نەخۆشە کۆمەڵگا نەخۆشتری دەکات!

ئاشق چەند بێ کەسە خەڵکی زیاتر بێکەسی دەکەن!

**هاوڕێ:** بۆچی وایە؟

**من:**چونکە هەرگیز ڕۆمانێکی ئەفسانەیی چیرۆکێکی بێمانا و شیعرێکی غەمبار چارەی دەردی ناکەن.

**هاوڕێ:** باشە

**من:**یادگاریەکان هەرگیز ڕێگا نادەن چێژ لە ژیان وەربگرێت و سود لە دەوروبەری ببینێت.

**هاوڕێ:** باشە.

**من:** زۆرێک لە کۆمەڵگایەکانیش مرۆڤ بنیات نانێن بەڵکو دەیان ڕوخێنن.

**هاوڕێ:** باشە چارە چیە؟

**من:** چەند کارێک هەیە پێویستە بگرینە بەر.

**هاوڕێ:** ئەوکارانە چنە ؟

**من:** با بە یەکەوە هەر ئاشقێک وێرانە سەر لەنوێ دروستیبکەینەوە.

با بە یەکەوە هەر ئاشقێک کە خراپە خراپیەکەی چاک بکەینەوە.

با بە یەکەوە سەرلە نوێ هیوا بە ئاشقە بێ هیواکان بدەینەوە.

با بە یەکەوە گریانی ئاشقان بوەستێنین، لە بری ئەوە زەردەخەنەیان پێ ببەخەشینەوە.

با بە یەکەوە دڵ ناسکیان نەهێڵین وایان لێبکەین بەرامبەر ئازارەکان بوەستن.

با بە یەکەوە گۆشەگیری ئاشقان نەهێڵین گۆشە نیگایەکی جوانیان پێ ببەخشین.

با بە یەکەوە نەخۆشی ئاشقەکان چارەسەر بکەین.

با هەمووومان بە یەکەوە ببین بەکەسی ئاشقەکان و لە تەنیایی ڕزگاریان بکەین.

**هاوڕێ:** جا ئەوە دەکرێ ؟

**من:**بەڵێ ئەگەر ئێمە و ئاشق بمانەوێ!

**ڕوکردنەوە:**

لێرە باسی ئەشق کراوە، مەبەست لێی ئەوەیە خەڵکی لێی دوربکەونەوە، یان ئەوانەی توشبوونە دەتوانن وازبێنن، چونکە دەبینین کەم تا زۆر کاریگەریەکی نەرێنی لەسەر خودی کەسەکان و کۆمەڵگا دروست کردوە، وە لە دینیشدا ڕێگە پێدراو نیە، زۆرێک لەشتەکان لایەنی باشە و خراپەیان هەیە، کە لێرە باسی چیرۆک و شیعر کراوە، مەبەست ئەوانەن کە هەوڵی ڕوخانی بەرامبەر دەدەن نەوەک بنیات نانەوەی.

# هاوسەرگیری

**هاوڕێ:** السلام علیکم.

**من:** وعلیکم السلام.

**هاوڕێ:** چۆنی؟

**من:** باشم الحمد لله، تۆ چۆنی؟

**هاوڕێ:** باشم بەڵام مێشکم زۆر ئاڵۆزە.

**من:** بۆچی؟

**هاوڕێ:** بڕیارێکم داوە.

**من:** چ بڕیارێک ؟

**هاوڕێ:** بڕیارم داوە هاوسەرگیری بکەم.

**من:** ئێ زۆر باشە لەسەر خێر.

**هاوڕێ:** بەس کێشەیەکم هەیە!

**من:** چ کێشەیەک؟

**هاوڕێ:** نازانم کێ هەڵبژێرم؟

**من:** هیچ کەس هەیە بتەوێت لە گەڵی هاوسەرگیری بکەی؟

**هاوڕێ:** کەسێکی تایبەت نیە بەڵام چەند کەسێک هەن وەکو ئەگەر لە لای خۆم دامناون.

**من:** جا بزانە کامیان باشە و پێت ڕازیە ئەو هەڵبژێرە.

**هاوڕێ:**ئێ نازانم!

**من:** باشە هاوڕێ وەرە با هەندێك گفتوگۆ بکەین پێش ئەوەی باسی ئەو بابەتە بکەین.

**هاوڕێ:**باشە فەرموو.

**من:** چەند پسیارێکت لێ دەکەم بەڕاستی جوابم بدەوە.

**هاوڕێ:** باشە

**من:** هاوسەرگیری چیە؟

بۆچی هاوسەرگیری دەکەی؟

ئایا مافەکانی هاوسەر دەزانی؟

ئایا دەزانی چ بەرپسیاریەکت دەکەوێتە سەر مل ؟

ئایا دەزانی ژیان دوای هاوسەرگیری شتێکی ترە؟

ئایا دەزانی چۆن هەلسوکەوت بکەی ؟

**هاوڕێ:** بیرم لەوانە نەکردۆتەوە تەنهاماڵەوەمان گوتیان تۆ بۆ هاوسەرگیری ناکەی، ئیتر منیش بیرۆکەکەم پێ جوان بوو ویستم هاوسەرگیری بکەم!

**من:** ئێ هاوڕێ وا نابێت، بەقسەی کەسانی تر بڕیارێکی وا گرینگ بدەیت.

**هاوڕێ:** باشە، ئێستا تۆ باسی ئەوەم بۆ بکە پێویستە چی بزانم یاخود چی بکەم؟

**من:** هاوڕێ هاوسەرگیری کارێکی زۆر باش و پیرۆزە

پێغەمبەر صلى الله على وسیلم فەرموویەتی.

(عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ؛ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ).[18]

واتا: هەرکەسێ لە ئێوە توانای هەیە با ژن بهێنێت چونکە ژنهێنان باشترین هۆکارە بۆ چاو پارێزی و داوێن پارێزی، هەرکەسیش ناتوانێ با ڕۆژو بگرێت چونکە بۆی دەبێتە قەڵغان.

بۆیە هاوسەرگیری کارێکی زۆر بەجێیە بەڵام هەندێ شتی پێویستە.

**هاوڕێ:** وەکو ؟؟

**من:** هاوسەرگیری چیە ؟

**هاوڕێ:** مارە بڕینە لەنیوان دوو کەسدا لە ڕەگەزی جیاواز.

**من:** باشە لەوە زیاتر؟

---

[18] مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

**هاوڕێ:** نازانم!

**من:** هاوڕێ واتا هێنانی ئافرەتێک لەژێر نازی دایک و باوکی بۆ لای خۆت!

واتا بەجێ هێشتنی هەموو کەسێکی بۆ تۆ!

واتا هەردووکتان کە ئەو بڕیارە دەدەن ڕێگایەک دەگرنە بەر کە پڕە لە گوڵ و گوڵزار بەڵام لە هەمان کاتدا پڕە لە هەوراز و نشێوی!

**هاوڕێ:** باشە.

**من:** بۆچی هاوسەرگیری دەکەی ؟

**هاوڕێ:** بۆ ئەوەی چێژ لەژیان ببینم!

**من:** هاوڕێ گیان هاوسەرگیری زۆر مانایەکی لەوە گەورەتری هەیە کە زۆرێک لە خەڵکی بیری لێدەکەنەوە، هاوسەرگیری تەنها بەتالکردنەوەی ئارەزوە جنسیەکان نیە، هاوسەرگیری وەکو باخ وایە پێویستە باخەوانێکی باش بن باش خزمەتی بکەن، هاوسەرگیری واتا دروستکردنی ماڵێک لەکۆمەڵگا دا.

واتا بەرهەمهێنانی منداڵ و پەروەردەکردن، هاوسەرگیری واتا ڕازیبوون لەیەکتری لە هەموو خوشی و ناخۆشیەکاندا.

**هاوڕێ:** اهم باشە.

**من:** ژیان دوای هاوسەرگیری شتێکی ترە!

**هاوڕێ:** واتا چۆن ؟

**من:** دوای هاوسەرگیری ئیتر تۆ کۆمەڵێک ئەرکت

دەکەوێتە سەر.

دەبێ هەوڵی زیاتر بدەیت!

کات بۆ ماڵ و منداڵت دابین بکەیت!

هەوڵبدەی خۆشبەختیان بکەیت لە ڕوانگەی شەرعەوە،

هاوڕێ ئەوانەی کە وتم باش بیریان لێبکەوە بزانە توانای ئەوەت

هەیە ؟

دەتوانی مافیان بدەی؟

دەتوانی خۆشبەخت بیت؟

بڕو بیربکەوە سەیری حاڵت بکە، ئەگەر توانایی ئەو ئەرکەت هەیە

وەرەوە پێت دەڵێم کە چ کەسێک هەڵبژێری.

**هاوڕێ:**باشە هاوڕێ گیان زۆر سوپاس بۆ ئەو ئامۆژگاریانە بەڕاستی

من زۆر بە سادەیی تێگەیشتبووم دووبارە سوپاس.

**من:** الله تعالی چی چاکە ئەوت بۆ بێنێت و بیرت ڕۆشن بکات و

کارەکانت بۆ ئاسان بکات.

# بەشی دووەم

**هاوڕێ:** السلام علیکم.

**من:** وعلیکم السلام.

**هاوڕێ:** چۆنی؟

**من:** الحمد لله، تۆ چۆنی؟

**هاوڕێ:** الحمد لله زۆر باشم، دوێنێ دوای قسەکانت چومەوە باش بیرم لەو کارە کردەوە.

**من:** ئێ؟

**هاوڕێ:** بەڵێ توانای ئەوەم هەیە کە ئەو کارە بکەم.

**من:** الحمد لله، الله بۆت ئاسان بکات.

**هاوڕێ:** زۆر سوپاس، دەی ئێستا پێم بڵێ کێ هەڵبژێرم؟

**من:** هاوڕێ بڕیاردان لە هاوسەرگیری زۆر ئاسانترە لە بڕیاردان لە کەسێک بۆ هاوسەرگیری.

**هاوڕێ:** ڕاستە.

**من:** هەر مرۆڤێک کومەڵێ خولیا و ئارەزوی هەیەو وە تەبیعاتێکی جیاوازی هەیە و لەسەر جۆری کەسیاتی دەوێستێت.

وە حەز و ئارەزووەکانی مرۆڤ پێویستە لەگەڵ مەنتیقدا بگونجێن، وا نەکەن زیان بە دونیا و دوارۆژت بگەیێنن.

**هاوڕێ:** بەڵێ، باشە.

**من:** هاوڕێ بۆ هاوسەرگیری پێویستە حەز و خۆشیەکانت لەگەڵ ئەقڵ و مەنتیق و دیندا تێکهەڵکێش بکەی، نابێ هیچ کام لەمانە فەرامۆش بکەیت.

**هاوڕێ:** زۆر ڕاستە.

**من:**ئەوەی پەیوەندی بە حەز و خولیاکانتەوە هەیە من قسەی لەسەر ناکەم شتێکە تایبەتە بە خۆتەوە، کەس ناتوانێ قسەی لەسەر بکات، بۆ نموونە تۆ چاوی کاڵت پێ جوانە ئێمە نابێ هەوڵی ئەوە بدەین ڕەنگێکی ترت لا جوان بکەین, تایبەت بە خۆتە و تۆ هەڵیبژێرە.

**هاوڕێ:** باشە.

**من:** سەبارەت بە دین،

پێغەمبەر صلی الله علی وسلم فەرموویەتی:

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: ( تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا، وَلِحَسَبِهَا، وَلِجَمَالِهَا، وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ

بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ )[19]

واتا:لەبەر چوار مەبەست ئافرەت دەخوازرێت، یان بۆ ماڵ و سامانەکەی یان لەبەر بنەماڵەکەی یان لەبەر جوانیەکەی یان لەبەر دینداریەکەی، جا تۆئافرەتی دیندار بهێنە تا دەستت پڕ بەرەکەت بێت.

لەو فەرموودەیەدا دین پێشی هەموو شتێك خراوە، تۆش دەبێ لەپێش هەموو شتێکی دابنێیت.

هاوڕێ برۆ چەند ساتی تەنیا دابنیشە و ریزبەندییێکی دروست بکە, بزانە لەگەڵ کێ باشتر دەژیت، وە لە سەرەتای ریزبەندیەکەتدا دین دابنێ، کە تەواو بوویت برۆ بزانە کێ ئەو تایبەتمەندیانەی هەیە بۆ هاوسەرگیری, ئەگەربێت و مەرجی یەکەمی نەبوو هاوسەرگیری لەگەڵ مەکە!

بەمشێوەیە کەسێکی شایستە دەدۆزیتەوە.

**هاوڕێ:** زۆر سوپاس بۆ ئەوقسە ئاڵتونیانە دلخۆشم کە کەسیکی وەک تۆم هەیە.

**من:** دلخۆشبیت هاوڕێ گیان.

---

[19]مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

## ڕونکردنەوە:

سەبارەت بە ئافرەت بۆ هاوسەرگیری، ئەوانیش وەکو پیاو پێویستە هاوسەرگیری بکەن، هەرچەندە بۆ ئافرەت کەمێ قورسترە چونکە پیاوان خوازبێنی دەکەن، بەڵام ئەوانیش ئەگەر هاتو ئەوکەسەی خوازبێنی دەکات کەسێکی بەدین و ڕەوشتێکی باشی هەبێت، ئەوا داواکاری ڕەتمەکەنەوە و هاوسەرگیری بکەن، چ زوو یان درەنگ ئەوە سونەتێکی ژیانە پێویستە بیکەن، بەڵام تا زوتر بێت باشترە بۆ دنیا و قیامەت.

# خۆشبەختی

**هاوڕێ:** السلام علیکم.

**من:** وعلیکم السلام.

**هاوڕێ:** چۆنی باشی؟

**من:**الحمد لله، تۆ چۆنی؟

**هاوڕێ:** باشم سوپاس، پسیارێکم هەیە ؟

**من:** فەرمووگیان.

**هاوڕێ:** ئەو پسیارە دەمێکە بەدوای وەڵامیدا دەگەڕێم و دەپرسم، هەر کەسێک بەشێوازێک وەڵامی داوەتەوە.

**من:** پێم بڵێ بزانم چیە ئەو پسیارە؟

**هاوڕێ:** خۆشبەختی چیە؟

**من:** بۆمن شتێکە و بۆ کەسانێک زۆر شت.

**هاوڕێ:** ئەمە واتای چیە؟

**من:** هاوڕێ هەرکەسێک خۆشبەختی خۆی بەشتێک یان شتانێکەوە بەستۆتەوە.

**هاوڕێ:** واتا خۆشبەختی خۆت بەشتێک ببەستیەوە و ئەوشتەت هەبێ خۆشبەختی؟

**من:** نا مەرج نیە.

**هاوڕێ:** چۆن؟

**من:** زۆر جۆرە کەسمان هەیە.

**هاوڕێ:** ئەو جۆرانە چین؟

**من:** کەسانێک هەن خۆشبەخت بوون (لە ڕابردودا).

**هاوڕێ:** بەڵێ.

**من:** کەسانێک هەن خۆشبەختن (لە ئێستادا)،

**هاوڕێ:** باشە.

**من:** کەسانێک هەن بەتەمای خۆشبەختین (لە داهاتوودا)

کەسانێکیش هەین هیچ لەمانە نین, هەرلەخۆشبەختی تێناگەن.

**هاوڕێ:** کام لەم جۆرە کەسانە باشە و سەرکەوتووە؟

**من:** هاوڕێ ئەگەر دەتەوێت خۆشبەخت بیت و دڵخۆشبی یاسایەک هەیە بیزانە.

**هاوڕێ:** ئەو یاسایە چیە؟

**من:** هەرخۆشیەک کاتی بێ ئەوخۆشیە خۆشی نیە!

هەر نەخۆشیەکیش کاتی بێ ئەونەخۆشیە نەخۆشی نیە!

**هاوڕێ:** باشە.

**من:** بۆیە هەرکەسێ وابزانێ خۆشیە کاتیەکان خۆشبەختین خۆشبەخت نابێ!

وە هەرکەسێکیش وابزانێ هەبوونی نەخۆشیە کاتیەکان خۆشبەختی ئەوی نەهێشتووە دیسان خۆشبەخت نابێ!

**هاوڕێ:** وایە، چۆن دڵ خۆش و خۆشبەخت بم؟

**من:** ڕازیبە بە ئێستات، هیوات بە داهاتوو هەبێ.

**هاوڕێ:** واتا؟

**من:** واتا خودا ناس بە، بزانە کە تۆی داهێناوە ژیان و مردنیشت هەر بەدەستی ئەوە، هەر ئەوە خاوەنی تۆ، وە ئەوشتانەی کە هەتە، هەر ئەویشە دەتوانێ داهاتووت پێ ببەخشێت.

بۆیە ئەوەی الله تعالیٰ ئێستا پێی داوی پێی ڕازی بە،

وە هیوات هەبێ کە الله تعالی داهاتوویەکی باشت پێدەدات. ئەگەر لە ژیانی کاتی دنیاشدا نەبێ لە دوا ڕۆژدا(قیامەت) بەهەشتێکی پان و بەرینت پێ دەدات کە هیچ ناخۆشی و نارەحەتێکی تێدا نیە.

**هاوڕێ:** ڕاستە.

**من:**هاوڕێ ئەوەیە خۆشبەختی کە الله تعالی لێت ڕازی بێت!

خۆشبەختی ئەوەیە لە مانای خۆشبەختی تێبگەی!

خۆشبەختی ئەوەیە ڕاستی و ناڕاستی لەیەکتر جیابکەیەوە!

لە تاریکیەکانەوە بەرەو ڕۆناکی بچی!

هاوڕێ: زۆر ڕاستە.

**من:** هاوڕێ ئێستا لەمانای خۆشبەحتی تێگەیشتی؟

**هاوڕێ:** بەڵێ زۆر بە جوانی.

**من:** کەواتە من پسیارێکت لێدەکەم سەبارەت بە خۆشبەخی و دلخۆشی؟

**هاوڕێ:** باشە فەرموو.

**من:** هاوڕێ ئەگەر پێت بڵێم کەسێک لەزینداندایە و دەتوانێ دل خۆشبێ ؟

**هاوڕێ:** دەکرێت دواتر وەڵامت بدەمەوە؟

**من:** باشە.

**هاوڕێ:** سوپاس بۆ وتەکانت.

**من:** بەڵام وەڵامێکی جوانم دەوێ.

**هاوڕێ:** منیش بۆیە داوای کاتم کرد!

**من:** باشە، خۆشبەختبی.

# بەشی دووەم

**هاوڕێ:** السلام علیکم.

**من:** وعلیکم السلام.

**هاوڕێ:** وەڵامی پسیارەکەم بۆ هێناوی.

**من:** پێم بڵێ بزانم چیە؟

**هاوڕێ:** بەڵێ دەتوانێ خۆشبەخت و دڵخۆشبێ؟

**من:** چۆن ؟

**هاوڕێ:**گوێ بگرە.

**من:** باشە.

**هاوڕێ:**

ئەی ئەوکەسەی واهەست ئەکەی

دڵ لە زیندانا خۆشنابێ هەڵەی!

دڵ خۆشان ئەوکەسانەن الله تعالی یان بەتاک ناسیوە!

لە کونجی تاریکی زیندانا هیوایان بەو هەڵچنیوە.

**چی لەخۆشی دنیا بکەم گەر خالقم لێم رازی نەبێ.**

**چی لە ئازادی بکەم ئەگەر نورم رێگای ئەو نەبێ.**

**دڵخۆشم کە دەزانم تۆی بەدیهێنەری ئەرز و ئاسمان**

**هەر تۆشی لەنێوبەری زاڵمان.**

**خەم لەچی بخۆم گەرتۆ پشتوو پەنام بی**

**رێی شێر دەگرم تا پەیامت بەیان بی.**

**من:** زۆر جوان بوو !چۆن ئەو پسیارەت بەو شێوەیە وەڵام داوە یان چۆن بیرت بۆ ئەوە چوو؟

**هاوڕێ:** هاوڕێ دوای ئەوەی لەمانای خۆشبەختی تێگەیشتم مامەلەکردنم لەگەڵ ژیان گۆڕا.

**من:**باشە.

**هاوڕێ:**دوای پسیارەکەی تۆ، خانویەکمان هەیە لەگوند منیش

ویستم بچم لەوێ بیری لێبکەمەوە

**من:** باشە.

**هاوڕێ:** کەچووم خۆمم بە هەندێ شتەوە خەریک کرد تا دنیا تاریک بوو، منیش چووم بۆ ژورێکی تاریک و ڕۆناکیم بەکارنەهێنا.

**من:** بەڵێ.

**هاوڕێ:** کەمێک بە بێدەنگی دانیشتم و بیرم کردەوە، ئەگەر من ئازاد نەبم لەشوێنێکی واتاریک زیندانی بم، ئایا دەتوانم دڵخۆش و خۆشبەخت بم ؟

**من:** جوانە!

**هاوڕێ:** سوپاس بۆ خوا کە توانیم وەڵامەکە زۆر بەئاسانی بەدەست بێنم، خۆشبەختی پەیوەندی نیە بەوەی ئایا ئازادی یان لەزینداندای!

خۆشبەختی پەیوەندی نیە بەوەی کە ئایا نەخۆشی یان تەندروستی!

دەوڵەمەندی یان هەژارا!

بێ کەسی یاخود نا!

تۆ کەسێکت لەگەڵە کە الله تعالی یە کە فەرموویەتی (وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ

الْوَرِيدِ)[20]

واتا:سوێند بەخوا بێگومان ئێمە ئادەمیزادمان دروست کردووە و دەزانین چی بەدڵ و دەروونیدا دێت... ئێمە لەشاڕەگی دڵی لێی نزیکترین.

**من:** دەست خۆش هاوڕێ گیان وەڵامەکەت زۆر جوانە، الله خۆشبەختمان بکات.

**هاوڕێ:** زۆر سوپاس ئامین.

---

[20] ق ١٦

# دایک

**هاوڕێ:** السلام علیکم.

**من:**وعلیکم السلام .

**هاوڕێ:** چۆنی؟

**من:** باشم، تۆ چۆنی؟

**هاوڕێ:** باشنیم.

**من:** بۆچی؟

**هاوڕێ:**ئەمرۆ من و دایکم بووبە دەمەقالێمان.

**من:** واهەست ناکەم وابێ.

هاوڕێ: چۆن؟

**من:** نەبوە دەمەقالێتان بەلکو تۆ دەمەقالێت لەگەل کردووە!

**هاوڕێ:** بەلێ وایە.

**من:** بەردەوامبە.

بۆچی دەمەقالێت کردووە؟

**هاوڕێ:** چەند جار پێم گوتووە کە تەلەفۆنم بۆ نەکات کاتێ لە لای

هاوڕێکانمم، هەر تەلەفۆنم بۆ دەکات.

لە کوێی ؟

نەهاتیتەوە ؟

نانت خواردوە؟

**من:** خەمی تۆیەتی.

**هاوڕێ:** ئیتر من گەورە بوومە پێویست ناکات لێم بپرسێت!

**من:** هاوڕێ دەزانی لە مانای دایک نەگەیشتوی!

**هاوڕێ:** بۆچی؟

**من:** دایک مانای چیە؟

**هاوڕێ:** چیە؟

**من:** هاوڕێ دایک ئەو ناوە پڕ واتایە و پڕ مانایەی نێو کۆمەڵگایە، ئەو کەسەی هەموو کەس بێکەسە لە ونبوونی ئەو، ئەو دروستکراوەی الله تعالی، کە هەرکاتێ باسی سۆز و مێهرەبانی دەکرێ باشترین نموونە باسی دایک دەکرێت، هەرکاتێک ناوی دایک دەهێندرێت لەگەڵ خۆیدا چەندین شیعر و هۆنراوە و پەخشانی مانادار دەهێنێت، هاوڕێ دایک وشەیەکی کورت و مانایەکی گەورەیە، وشەیەکە شاعیران و زمانزان و فەیلەسوفان زمان لاڵن لە ئاست پێناسەیدا.

دایک ئەو کەسەی زۆرترین باسی دەکرێ و لە هەمان کاتدا زۆرترین ستەمی لێدەکرێ.

دایک ئەوکەسەی ژیانی بەندە بە ژیانی جگەرگۆشەکانی، ئەو کەسەی دڵخۆشی ئەو خەوی خۆشی منداڵەکانیەتی و دەستەبەرکردنی هەر شتێک کە پێویستیان بێت و داوای بکەن و بێبەش نەبن لێی.

ئەوە دایکە گریانی لە تەنیاییدا و پێکەنی لەنێو بێچوەکانی، ئەوە دایکە کە الله تعالی ڕازیبوونی خۆی لەهەندێ کاتدا پەیوەست کردوە بە ڕازیبوونی ئەوەوە، ئەوە دایکە ئەگەر زۆرترین پێویستی هەبێت سەرەتا پێویستی منداڵەکانی جێبەجێ دەکات.

هەبوونی خۆشی واتا هەبوونی ئەو، خۆشبەختی واتا ئەو، نەمانی خەم و خەفەت واتا بوونی ئەو.

دایک ئەو کەسەی لاشەی کردۆتە چەند بەشێک، بەشێک بۆ بەخێوکردنی ئێمە، بەشێکی کردۆتە قەڵغان بۆ پاراستنی ئێمە ، بەشێکی کردۆتە پایە بۆ سەرکەوتنەکانی ئێمە.

دایک واتا ئەو کەسەی هەرگیز خیانەت لە خۆشەویستی ڕۆڵەکانی ناکات .

هاوڕێ ئەوەیە دایک!

**هاوڕێ:** اهم!

**من:** هاوڕێ لە ژیانتدا قەت بێ دایک بووی؟

**هاوڕێ:** چۆن نەخێر؟

**من:** هاوڕێ دەزانی چەندەها کەس ئاواتەخوازە دایکیان هەبووایە پێش چوونەدەرەوەیان لەماڵ عەتریان بۆنی باوەشی ئەو بوایە؟

دەزانی چەندەها کەس عەودالی گۆشە نیگایەکی دایکیانن؟

دەزانی چەندەها کەس بێ هیوان لە هەواڵ پرسینێکی دایکیان؟

دەزانی چەندەها کەس بێ ئومێدن شەوانە پێش نوستنیان دایکیان سەرێکیان لێ بدات؟

هاوڕێ بڕۆپرسە لە دایکت هەبوونی دایک واتا چی؟

**هاوڕێ:** (لە گریاندا)

**من:**هاوڕێ ژیان کورتە وە دەرفەتەکانیش کورتتر.

الله تعالی دەرفەتێکی پێداوی بزانە مامالەی لەگەل بکەی.

تەوبە بکە دواتر بڕۆداوای لێبوردن لە دایکت بکە.

پێیەکانی ماچ بکە!

زەردەخەنەی پێ ببەخشەوە! بڕۆ هاوڕێ بڕۆ.

**هاوڕێ:** باشە.

# بەشی دووەم

**هاوڕێ:** السلام علیکم.

**من:** وعلیکم السلام.هاتیەوە؟

**هاوڕێ:** بەڵێ.

**من:** چیت کرد؟

**هاوڕێ:** چووم داوای لێبوردنم لێ کرد.

**من:**چی گووت ؟

**هاوڕێ:**گووتی کوڕم دەمێکە لەتۆم بوریووە خوا لێت ببوری!!

**من:** زۆر باشە.

**هاوڕێ:**بەس گوتی!

**من:**چی گووت؟

**هاوڕێ:** گووتی (خۆزگایە چەند ساتێک ئێوەی منداڵ هەست بە هەستی دایکتان بکەن بەرانبەر بە خۆتان .

هەردایکێک لە دوای بوونی منداڵێکی پارچەیەکی دلی دەبێ بە ئەو، ژیانی دەبێ بە ئەو، خوشیەکانی دەبن بە ئەو، ئەوەش قەینا کێشەکە ئەوەیە نازانێ دایکی چ هەستێکی بۆی هەیە، کاتێ لەماڵ دەردەچێ

دایکی حەزئەکا بیێ بە تاڵێ موو بەسەریەوە بۆ ئەوەی ئاگای لە هەنگاو بە هەنگاوی بێ، کورم کاتێ تەلەفونت بۆ دەکەم مانای ئەوەنیە تۆ گەورە نەبوویت!

کە شەوانە دێم بە بێدەنگی دەرگای ژوورەکەت دەکەمەوە سەیرێکت دەکەم مانای ئەوە نیە نازانی خۆت داپۆشی!

کاتێ دەڵێم کورم ئاگەداری خۆت بە مانای ئەوە نیە کە منداڵ بیت!

کورم ئەوە دڵی دایکە چی بکا ئۆقرە ناگرێ!)

دواتر بەچاوی پڕ فرمێسکەوە باوەشمان بەیەکدا کرد و ئاسایی بوینەوە

**من:** الحمدلله هاوڕێ

**هاوڕێ:**زۆر سوپاس

**ڕونکردنەوە:**

مەبەست لێرەدا ئەوەیە دایک یێیکە لە ناز و نیعمەتەکانی الله تعالی کە بە مرۆڤ بەخشیوە، زیاتر ڕێزی لێبگیرێ، بەڕاستی ئەوەی

دەیبینین لەهەندێ کەس نەک هەر ڕێزگرتن نیە لێی بەڵکو جێبەجێ نەکردنی هەموو بەها دینی و ئەخلاقیەکانە، چۆن دەبێ لە وڵاتدا خانەی بەساڵاچوان هەبێ، ؟

چۆن دەبێ دایکەکان لەسەر جادە سوال بکەن ؟

چۆن دەبێ دایک لێی بدرێت ؟

چۆن دەبێ دایک فرمێسکی لێ ببارێت بەهۆی منداڵەکانی، ئەوانە کوا ڕێزگرتنە لەدایک، کوا پێدانە مافە بەدایک، پێویستە هەموومان پێداچوونەوەیەک بەژیانماندا بکەین، ئەگەر دایکمان ماوە، لەمەو بەدوا خزمەتی بکەین، زەردەخەنەی پێبدەین، الله تعالی فەرمانی پێکردووین کە چاکە کاربین لەگەڵیاندا وە فەرموویەتی (وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا)[21]

واتا:پەروەردگاری تۆ بڕیاریداوە کە جگە لەو کەسی تر نەپەرستن، هەروەها بڕیاریداوە چاکەکاریش بن لەگەڵ دایك و باوکتاندا، هەر کاتێك یەکێکیان یان هەردووکیان بە پیری کەوتنە لای تۆ (تەنانەت ئۆفیان لە دەست مەکەو (هەرگیز) پیایاندا هەڵمەشاخێ و هاواریان

[21]الإسراء۲۳

بەسەردا مەکە، بەردەوامیش قسەو گفتو گۆت لەگەڵیاندا با چاك و جوان و بەجێ بێت.

بەڕاستی ژیان کورتە لەوانەیە زۆرجار دەرفەتی ئەوەمان پێنەدات بەهەڵەکانماندا بچینەوە، بۆیە تۆ ئێستا لە ژیانداى، ئەگەر دایکت لێت تۆراوە ئاوا ئاشتی بکەوە ئەگەر خزمەتت نەکردووە لەمەودوا خزمەتی بکە.

# ئافرەت

**من:** السلام عليكم.

**ئەو:** وعليكم السلام.

**من:** خوشکە چۆنی؟

**ئەو:** باشم سوپاس، تۆ چۆنی؟

**من:** باشم الحمد لله، چیە ئەوە بۆ وا دانیشتوی بیرلەچی دەکەیتەوە؟

**ئەو:** بیر لە گوزەرانی ئافرەت دەکەمەوە!

**من:** بۆ گوزەرانی ئەوان چۆنە؟

**ئەو:** هیچ!

گوزەرانیان هەر نەماوە تا چۆنیەتیت پێ بلێم!

**من:** جا کێ هۆکارە؟

**ئەو:** هەموو کەسێک، بە تایبەتی خۆیان.

**من:** باشە، بۆ نموونە چی گوزەرانی وا تێکداون؟

**ئەو:** زۆر شت!

**من:** وەکو؟

**ئەو:** ئێمە لە بنەڕەتدا مافمان هەیە، کەچی نە خۆمان دەزانین مافمان چیە نە ئەوانەی لە دەوروبەرمانن مافمان پێ دەدەن!

**من:**ڕاستە.

**ئەو:** باس باسی ئافرەتە، وەکو ئەوەی بەس ئافرەت هەبێ، کەچی ئەو شوێنەی بەیەکسانی ئافرەت و پیاو ناسراوە لە هەموو شوێنێك خراپترە.

**من:** وایە.

**ئەو:** لە بنچینەدا الله تعالى ئافرەت و پیاوی بۆ خۆشگوزەرانی و تەواوکەری یەکتری دروستکردوە خودای گەورە فەرموویەتی (وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ) [22]

**واتا:**یەکێك لە نیشانە و بەڵگەکانی تری ئەوەیە: کە هەر لە خۆتان هاوسەری بۆ دروست کردوون بۆ ئەوەی ئارام بگرن لەلایدا و لە نێوانتاندا خۆشەویستی و سۆزو میهرەبانی فەراهەم هێناوە، بەڕاستی ئا لەو دیاردانەدا نیشانە و بەڵگە هەیە بۆ کەسانێك بیردەکەنەوە و تێدەفکرن.

کەچی ئێستا چەند کەسانێک بە ناوی مافی ئافرەت ململانێیان لە

---

[22]الروم 21

نێوان ژن و پیاو دروست کردوە.

**من:** بەڵێ.

**ئەو:** پێشتر ئافرەت گەورەی ماڵ بوو خزمەتی دەکرا، ئەو تەنها پشوی دەدا، بەلام ئێستا ئافرەت خۆی داوای کاردەکات و پیاویش داوای ئافرەتی خاوەن کاردەکات تا ئیشی بۆ بکات!

**من:** ڕاستە.

**ئەو:** پێشتر ئافرەت خۆی قوتابخانەی منداڵەکانی بوو ئێستا داینگە![23]

**من:** وایە.

**ئەو:** ئافرەتان ئەو ئەرکەی کە هەیانە لە کۆمەڵگا لەبیریان کردوە و بەتەمای شتی ترن.

برام ئێستا ئافرەت نازانێ چی دەکا!

چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرێ!

ئافرەت وەکو کاڵایەک سەیر دەکرێ!

تەنها بۆ ئارەزوە جنسیەکان بەکار دەهێنرێت!

**من:** خوشکە دەزانی چارە چیە؟

**ئەو:** چیە؟

---

[23] مەبەست لێرە ئەوە نیە داینگەکان خراپ بن، بەڵام دایک دەبێ ڕۆڵی خۆی لەبیر نەکات.

**من:** پێویستە لەخەوی غەفلەت هەستنەوە و ئافرەت بن پیاو نەبن،

خوشکە دەزانی بۆچی زۆربەی ئافرەتان دڵیان شکاوە؟

**ئەو:** بۆچی؟

**من:**چونکە دڵیان شوشەیە و لەسەر ڕێگایان داناوە!

**ئەو:** وایە.

**من:** زوو هەڵدەخەڵەتێن بە دووقسە هەوریان لێ ئەبێ بە سامال[24]

**ئەو:** زۆر ڕاستە خوا پشت و پەنامان بێت، لە دەستی نەزان ڕزگارمان بێت!

---

[24]لێرە مەبەست بەشێکە نەک هەموویان

# بەشی دووەم

**ئەو:** برام.

**من:** بەڵێ.

**ئەو:** ئەی دەزانی کێشەی گەورەتری کچان بەدەست کوڕانەوەیە!

**من:** بۆچی؟

**ئەو:** چونکە هەمیشە فێڵیان لێ دەکرێت!

خیانەتیان لێ دەکرێت!

دڵیان دەشکێندرێت!

**من:** خوشکم تۆ ئەوەت بەسەر هاتووە؟

**ئەو:** نا سوپاس بۆ خوا.

**من:** بۆچی بەسەرت نەهاتووە؟

**ئەو:** چونکە تۆ هەمیشە ئەوەت گوتووە کە ئەوەی ڕاستە ئەوە بکەن نەک ئەوی ئارەزوتان داوای دەکات.

هەرگیز هەڵ مەخەڵەتێن بە زەردەخەنەیەکی دەستکرد و قسەی بریقەدارا!

خۆشەویستی دوای هاوسەرگیریە نەک پێشی!

ئەو کەسەی تۆی دەوێ دەبێ بە خۆشحاڵی و ڕازیبوونێکی تەواوەوە بێت و خوازبێنی تۆ بکات لەباوکت بەشکوم بە سەربەرزی پێیڕازیبی نەوەک لەسەر جادە!

تۆ پێت گوتم  ئاشقبوون ڕێگای دڵخۆشی نیە, ڕێگای خەم و خەفەتە!

تۆ گوتت خوا چی پێ خۆشە ئەوە بکەن!

ئەوانەی تۆ گووتوتە جێبەجێم کردووە،  بۆیە ئەوەم بەسەر نەهاتووە!

**من:** خوشکم ئەوانەی بەسەر ئافرەتدا دێت زۆربەی خۆیەتی!

هەرگیز کوڕێک ناتوانێت دڵی کچێک بشکێنێت ئەگەر کچەکە دڵی بۆ نەکاتەوە!

هەرگیز کوڕێک ناتوانێت فرمێسک لە چاویان بێنێت ئەگەر چاویان نەکەن بە نیگای ئەوان!

هەرگیز ناتوانن بیان گریێنن ئەگەر پێشتر خۆیان بە ڕوویاندا پێنەکەنن!

**ئەو:** ڕاستە برام.

## ڕونکردنەوە:

کورتەی مەبەست:

**یەکەم**: زیاتر مەبەست ئەوەیە پەیوەندی نێوان خوشک و برا پتەوتر بکرێت، توانای ئەوەیان هەبێت دەرد و بەڵا و کێشە لە لای یەکتر باس بکەن، باسی گوزەرانی ئەمڕۆی مرۆڤایەتی بکەن، زیاتر وەکو هاوڕێ مامەلە بکەن و پشتیوانی یەکتر بن، یەکتری ڕێنوێنی بکەن بۆ ڕێگای ڕاست و باش، ئامۆژگاری یەکتر بە هەند وەربگرن، بزانن و بۆ یەکتری بسەلمێنن کە دلسۆزی یەکترن.

**دوو**: کە باسی ئافرەت بەگشتی کراوە، ئەوەی ئەمڕۆ دەگوزەرێ لە نێو کۆمەلگایەکان و بەتایبەتی کۆمەلگای کوردەواری، ئافرەت ئەو سەنگەی نەماوە، وەکو پێشتر لەسەر دین و کلتوری کوردەواری ڕێزی لێناگیرێت، ئەوەش بەهۆی چەند هۆکارێکەوەیە .

وەکو بێ ئاگایی ئافرەت لە مافە ڕاست و ڕەوانەکانی خۆی، داواکردنی مافەکانی خۆی لەو شوێنەی کە مافی بە ڕەوا دەزانێ.

دەست گرتن بەدینی پیرۆزی ئیسلامەوە، کە تاکە دینە زۆرترین مافی بە ئافرەت داوە لە بەرامبەر کەمترین ئەرکدا، لە ئاینی پیرۆزی

ئیسلامدا ئافرەت هەموو مافێکی هەیە وەکو(مافی فێربوونی زانست، مافی گیانی، مافی ئابووری، مافی سیاسی، مافی کۆمەڵایەتی ) لە هیچ لەوانە بێبەش نەکراوە.

ئەوەی هەڵەیە لای ئافرەتان داوای وەکو یەکبوون دەکەن ! ئەوەش هەڵەیەکی گەورەیە، الله تعالى هەریەک لە پیاو و ئافرەتی بەشێوەیەکی جیاواز لە ڕەگەز و توانایی جەستەیی و دەروونیی دروست کردووە بۆ ئەوەی تەواوکەری یەکترین لە دنیادا ، ئیسلام لەگەڵ یەکسانی پیاو و ئافرەت دایە بەڵام لەگەڵ وەکو یەکبوون دا نیە، ئەگەر بە ئەقڵی مەنتیق لێکیبدەینەوە دوور لە کاریگەری هەست و سۆز ڕاستیەکە ئەوەیە.

**سێ**: ئەوەی دەبینن لە نێو کۆمەڵگا کێشەی زۆر بڵاوبۆتەوە، بەتایبەت لە ناو گەنجاندا، خۆکوشتن و خۆ سوتاندن، نەخۆشیە دەرونیەکان لە زۆربووندان، ئەوەش ئەگەر بەردەوامبێت کۆمەڵگا بەرەو لەناوچوون دەچێت و، شیرازی خێزان تێکدەچێت، کاریگەری ڕەگەزەکان لەسەر یەکتر و هەڵ خەڵەتاندنی یەکتری بەهەرشێوازێک بێت لە شێوازەکان ڕوو لەزیادبوونە، بۆیە مەبەستم لێرە زیاتر ئەوە بوو کە گەنجان زیاتر و وردتر مامەڵە لەگەڵ

پێشهاتەکان بکەن، کە زیاتر لایەنی ئەقڵ و زانین بەسەر مرۆڤدا زاڵ بێ نەوەک هەست و سۆز.

# شوفێری تەکسی و هەژاری!

**من:** السلام عليكم مامە.

**مامە:** وعليكم السلام.

**من:** مامە دەچی بۆ پەیمانگای پزیشکی؟

**مامە:**بەڵێ، بۆ ناچم کوڕم؟

**من:** بە چەند دەچی؟

**مامە:** چوار هەزار دینار.

**من:** مامە من هەر بە سێ هەزار دینار دەچم.

**مامە:** وەرە کوڕم سوار بە.

**من:** زۆر سوپاس مامە.

**مامە:**فێرخوازی؟؟

**من:** بەڵێ مامە گیان.

**مامە:** کوڕم مادام فێرخوازی ئاواشبێ ئاساییە.

**من:** زۆر سوپاس

**مامە:** کوڕم کەس وەک من نازانێ فێرخواز لە چ گوزەرانێکی قوڕس

دایە.

**من:** بۆچی مامە تۆش فێرخوازت هەیە؟

**مامە:** کوڕم من چوار کچم هەیە، هیچ برایێکیان نیە.

**من:** مامە من برای ئەوانم.

**مامە:** سەلامەت بی، سێیان لە زانکۆ دەخوێنن و ئەوەی تریشیان لە ئامادەیی.

**من:** الله تعالی سەرکەوتوویان بکات بە چاکە.

**مامە:** کوڕم بژێوی هەموومان لەسەر ئەو تەکسیەیە و کاری تەکسیش ڕۆژبە ڕۆژ لە خراپبوون دایە!

**من:** ڕاستە.

**مامە:** کوڕم کچێکی زانکۆم ئەوە یەک هەفتەیە چاویلکەکەی شکاوە بە منی نەگوتووە، دەڵێ باوکم توانای کڕینی نیە با خەم نەخوات!

**من:** بەڵێ.

**مامە:** بەڵام کاتی تاقیکردنەوەیە توانای خوێندنی نیە و چاوەکانی ژان دەکات!

ئەمڕۆ بەیانی هات بۆ لام زۆر بە شەرمەوە گوتی باوکە گیان بۆ ناچی بۆ لای مامم بەڵکو شتێکی لێوەربگری تا بتوانیت چاویلکەکەم بۆ چاک بکەیتەوە، منیش دڵیم نەشکاند گوتم باشە بەسەرچاو کچم،

منیش پێشی کار سەردانی براکەم کرد لە دووکان و پێم گوت، برام کچەکەم چاویلکەکەی شکاوە خۆشت دەزانی توانای دارایم کەمە، ئەگەر بتوانی کەمێک لەتۆ وە کەمێک لەمن بەشکوم بتوانم چاویلکەکەی بۆ چاک بکەم، کاتی تاقیکردنەوەیە، براکەشم بە ڕوییکی ناخۆشەوە و بەدەنگی بەرز گوتی من منداڵی تۆ بەخێوبکەم؟ پێم ناکرێ بەسە تۆش ئەو کچانە لە خوێندن دەربێنە زۆرقسەی نەخۆشی کرد، دەمگوت خۆزگایە دەستم بشکایە و ئەو داوایەم نەکردایە، ئیتر بەم شێوە ئەوم بەجێهێشت، هاتووم بزانم شتێکم دەست ناکەوێت، کچەکەم تەلەفونی کرد وتی باوکە چویت بۆ لای مامم، منیش گوتم نا کچم نا نەچووم، دوای داخستنی تەلەفۆنەکە بە خۆمم گوت ئەوەی من چوم بۆ لای برا نەبوو . إن شاء الله چارەدەبێ، ئیتر بەتەمای خودا.

**من:** خودا گەورەیە مامە.

**مامە:** کوڕم چاکە ماوە بەڵام زۆر کەم!

سۆز و میهرەبانی ماوە بەڵام زۆر کەم!

ویژدان ماوە بەڵام زۆر کەم!

**من:** ڕاستە.

**مامە:** کوڕم لە ئێستادا ستەمکار و ستەم لێکراو لە مرۆڤ تێکچوە و

ناتوانێ لێکیان جیا بکەیتەوە، ستەمکار ستەم لە ستەملێکراو دەکات ستەم لێکراویش بۆی پەردەپۆش دەکات.

**من:** مامە ڕزق بە دەستی خودایە، ئێمەش لە دنیاداین و لە تاقیکردنەوەداین، ژیان قورسی تێدایە و پێویستە بەرگەی بگرین.

**مامە:** وایە زۆر ڕاستە، ئەگەر ڕزق بە دەستی بەندەکان بوایە هەرگیز بە یەکتریان نەدەدا.

**من:** مامە اللە تعالی فەرموویەتی(وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا لَا نَسْأَلُكَ رِزْقًا نَّحْنُ نَرْزُقُكَ وَالْعَاقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ)[25]

واتا:(ئەی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم، ئەی ئیماندار) فەرمان بدە بە هەموو تاکەکانی خێزانت، تا نوێژەکەیان (بەچاکی ئەنجام بدەن، چونکە خۆراکی ڕۆحە) و بەردەوام و کۆڵنەدەر و خۆڕاگربە لەسەری، ئێمە بێگومان داوای ڕزق و ڕۆزی لە تۆ ناکەین، بەڵکو ئێمە ڕزق و ڕۆزی بە تۆ دەبەخشین، سەرەنجامی چاک هەر بۆ خواناسی و دینداریە.

**مامە:** ڕاستە کوڕم.

**من:**تەواو مامە گەیشتین.

**مامە:** باشە کوڕم.

---

[25] طه 132

**من:** ئەوەش مافەکەت.

**مامە:** لێیگەڕێ کوڕم.

**من:**نا مەمە نابێت زۆر سوپاس،

خوات لەگەڵ.

**مامە:** خوات لەگەڵ کوڕم

**من:**ئای هەی  مامە تۆش یەکێکیت لەو چەندەها نموونەی کە وا ژیان بە قورسی دەبەنە سەر،  ئای مامە من و تۆ چەند پێویستیمان بە ژینگەیێکە بەندەکان تواناى ئەوەیان نەبێت ستەم بکەن چەند پێویستمان بە شوێنێکە کە دادپەروەری تێدا بێت .

**ڕونکردنەوە:**

مەبەست لێرە ئەوەیە:

**یەکەم:** گوزەرانی فێرخوازان و ئەوکەسانەی هەوڵی فێربوونی زانست و زانستی شەرعی دەدەن،  زۆر قورس و پڕ ئێش و ئازارە،  ڕۆژانە چەندان  کێشە و گرفت بەرۆکیان دەگرێت،  بۆیە ئێمە بەپێی توانا پێویستە یارمەتی فێرخوازان بدەین بۆ ئەوەی لە داواکردنی زانست

بەردەوامبن، کۆمەڵگا زیاتر ڕۆشنبیر بکەن.

**دووەم:** نەبوونی یارمەتی لەنێوان براو برا یاخود هاوڕێ و هاوڕێ، ئەمە ئەو پەڕی دڵ ڕەقیە، هەرکەسێک پێویستی بە تۆ هەبێ و تۆ دەستی یارمەتی بۆ درێژ نەکەیت

چۆن ئاسودە دەبیت ؟ تۆ ئەمڕۆ توانات هەیە سبەی کەسێکی تر ئەوە بزانە الله تعالى فەرموویەتی(الْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ الْحَقُّ لِلرَّحْمَٰنِ وَكَانَ يَوْمًا عَلَى الْكَافِرِينَ عَسِيرًا)[26]

ئەو ڕۆژە ئیتر مولک و دەسەڵاتداری ڕاستەقینە بە دەست خوای میهرەبانە، بێگومان ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی زۆر سەخت و دژوار دەبێت لەسەر بێ باوەڕ و خوانەناسان (زۆر پەشیمان دەبن).

ئەمڕۆ توانات هەیە یارمەتی بدە!

---

[26] الفرقان 16

## دەرون

**هاوڕێ:** السلام عليكم.

**من:** وعليكم السلام.

**هاوڕێ:** چۆنی؟

**من:** باشم الحمد لله، تۆ چۆنی؟

**هاوڕێ:** باشم!

**من:** باشەکەت لە باش ناچێت؟

**هاوڕێ:** نا لەڕوی جستەوە باشم.

**من:** ئەی کێشەت لە کوێ هەیە؟

**هاوڕێ:** دەروونم ئارام نیە!

**من:** واتا چۆن؟

**هاوڕێ:** هەست بە ئارامی ناکەم!

**من:** بۆچی هیچ کێشەیەک هەیە؟

**هاوڕێ:** نەخێر.

**من:** ترست لەشتێک هەیە؟

**هاوڕێ:** نەخێر.

**من:** بلێم چی؟

**هاوڕێ:** کەمێک ئامۆژگاریم بکە.

**من:** بۆچی ئەو داواکاریە لەو کاتەدا؟

**هاوڕێ:** ئیتر نازانم حەزم کرد.

**من:** چ ئاموژگارێک بێت و لەبارەی چیەوە بێت؟

**هاوڕێ:**ئامۆژگاریێک بێت دەروونم ئارام بکاتەوە!

**من:** باشە هاوڕێ گوێ بگرە.

**هاوڕێ:** باشە.

**من:** هاوڕێ هەرکاتێک باسی دەروون دەکرێت من یەک ئەندامی جەستەم لە خەیاڵە.

**هاوڕێ:** کامە ئەندام؟

**من:** دڵ هاوڕێ دڵ!

**هاوڕێ:** باشە.

**من:** هاوڕێ ئەوە دڵە کاریگەری لەسەر هەموو ساتەکانی ژیانت هەیە ئەگەر دڵ ئارامبێت ئەوا هەست بە ئارامیێکی زۆر دەکەی.[27]

---

[27]ن النعمان بن بشير رضي الله عنهما قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: «أَلَا وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلَا وَهِيَ الْقَلْبُ». متفق عليه

**هاوڕێ:** باشە زانیمان کە دڵ کاریگەری هەیە.

**من:** بەڵێ.

**هاوڕێ:** ئێ چۆن دڵ ئارام بکەین دڵ بە چی ئارام دەبێ؟

**من:** هاوڕێ الله تعالی لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی

(الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللَّهِ أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ)[28]

واتا:ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو دڵ و دەرونیان ئارام دەبێت بە قورئان و پەیامەکەی خوای پەروەردگار، ئاگاداربن دڵەکان: هەر بە قورئان و یادی خواو (پاپەندبوون بە ئاینەکەیەوە) خۆش دەبن و دەحەوێنەوە.

**هاوڕێ:** ڕاستە.

**من:** هاوڕێ ئەوەیە چارەسەر، یادی ئەوکەسە بکە کە ئاگەدارە بەوەی لەناو دڵی تۆدایە، ئاگەدارە بەوهەموو کێشە و گرفتانەی بەرێت کردوە و ئێستا تێیدایت ولە داهاتوودا بەرەو لای تۆ دێن!

ئاگەدارە بە هەموو هیوا و ئاواتەکانت!

**هاوڕێ:**بەڵێ ڕاستە ماوەیەکە دوورم لە زیکرەکان

تا ئێستا نەمدەزانی ئارامی دەرون لەیادی پەروەردەگاردایە!

---

[28]الرعد 28

**من:** بەڵێ هاوڕێ، الله تعالى دڵنیاشمان دەکاتەوە کە بە جگە لەوە دڵ و دەرونت ئارام نابێتەوە

**هاوڕێ:** ڕاستە الله تعالى پاداشتت بداتەوە.

**من:** دڵ خۆش و دەروون ئارامبیت هاوڕێ.

**ڕونکردنەوە:**

ئەوەی لەم ڕۆژگارەدا دەبیندرێت و دەبیسترێت زۆربوونی یەکێکە لە نەخۆشیە هەر کوشندە و ترسناکەکان ئەویش پێ دەگوترێت نەخۆشی دەروونی، یان هەر ناوێکی لێ بنرێت کە مرۆڤ دەرونێکی ئارامی نیە، خۆشی لە خۆشیەکان وەرناگرێت، گۆشەگیردەبێ، لەسەرکەووتن دووردەکەوێتەوە، لە خوێندن پاشدەکەوێت، پەیوەندی کۆمەڵایەتی زۆر لاواز دەبێت، ئەو نەخۆشیە یەخەی زۆرێک لە خەڵکی گرتووە، نازانن چۆن چارەسەری بکەن، چۆن خۆیانی لێ ڕزگار بکەن، بەڵام الله تعالى پێی ڕاگەیاندووین کە زۆرێک

لە هۆکارەکان پشتکردنە لە یادی خودای گەورە و بەرنامەکەی کە فەرموویەتی:

(وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَىٰ ) [29]

واتا:ئەوەیش ڕوو وەربگێرێت لە بەرنامە و یادی من پشتی تێ بکات، بێگومان بۆ ئەو جۆرە کەسانە ژیانێکی ترش و تاڵ و ناخۆش پێش دێت، لە ڕۆژی قیامەتیشدا بەکوێری حەشری دەکەین.

بۆیە بۆ ئەوەی دەرونێکی ئارام و تەندروستمان هەبێت دوریین لە هەبوونی وەسوەسەیەك، ئەوا با دەست بە یادی الله تعالی وە بگرین.

[29] طه 124

# شار و شاخ

**من:** السلام عليكم.

**مامه:** وعليكم السلام كوڕم.

**من:** مامه چۆنی باشی؟

**مامه:** باشم سوپاس بۆ پەروەردەگار، تۆ چۆنی؟

**من:** سوپاس بۆ خوا باشم.

**مامه:** یاخوا هەر باشبیت.

**من:** مامه ژیانی شاخ چۆنه؟

**مامه:** زۆر باشه کوڕی من.

**من:** یاخوا هەر باشبن.

**مامه:** سوپاس کوڕم، ئەی ژیان لە شار چۆن بەڕێوە دەچێ ؟

**من:** زۆر خراپ مامه زۆر خراپ!

**مامه:** بۆچی کوڕم؟

خوا نەخواستە شتێک بووە ؟

یاخود برسیەتی ڕووی تێکردوون؟

**من:** نا مامە نا ئەو شتانە نیە.

**مامە:** ئەی لافاو ئێوەی بردووە؟

**من:** نا مامە ئەوەش نیە!

**مامە:** ئەی خۆ بومەلەرزە نەبووە؟

**من:** نا مامە!

**مامە:** ئەی چی بووە کورم؟

**من:** مامە شتی وا ڕودەدەن کە ئێستا تێگەیشتنی ئەو شتانە لای تۆ زۆر غەریبن!

**مامە:**وەکو چی؟

**من:** زۆر شت مامە! زۆر شت گۆڕاوە.

**مامە:** چ شتێک گۆڕاوە؟

**من:** مامە شیرازەی خێزان بەرە بەرە بەرەو لەناوچوونە!

کلتورمان شتێکە و ئەوەی ئەمڕۆ دەگوزەرێ شتێکی ترا!

دینداری زۆر لاواز بووە!

موسڵمانان غەریب و نامۆنە!

ئافرەت کاتێک پیاوەکەی بۆ کارێک دەچێت بۆ شوێنێک، ئەو خەریکی خیانەت دەبێ!

پیاو کاتێک لەدەرەوەیە بۆی بڕەخسێت خیانەت لە هاوسەرەکەی

دەكات!

باوک ناتوانێ ئامۆژگاری کچەکانی بکات و لەداستی خەڵکی ڕزگاری بکات!

دایک ناتوانێ داواکاریەک لە کوڕەکانی بکات!

زۆربەی کەسەکان دەخوێنن، بەڵام زۆرکەمیان دەخوێننەوە!

زانست بووە بە شتێکی نامۆ و کەس بەدوای ناکەوێت!

پەیوەندی کۆمەڵایەتی باوی نەماوە, باو باوی پەیوەندی سۆزداریە!

نەخوێندەوار خوێندەوارەکان بەڕێوە دەبات!

جوانکاری بووە بە یەکێک لەپایەکانی ڕۆشنبیری!

کەس ڕێز لەکات ناگرێت!

ڕۆژیان نوستنە و شەویان بە ئاگایی!

لە تاریکستانیەکی زۆردا دەژین!

هەوا و ئارەزوەکان زاڵبوونە بەسەر خەڵکی دا!

ڕێژەی جیابوونەوە شان بەشانی ڕێژەی هاوسەرگیریە!

کەسانێک پەیدابوون بانگەوازی بێدینی دەکەن!

نەخۆشخانەکان پڕن لە نەخۆش!

مزگەوتەکان بێ نازکەوتوون!

خەڵکی ڕویان لە ئاهەنگە بێماناکان کردووە!

پەروەردەی منداڵ زۆر خراپ بووە!

منداڵ فێری زمان دەکرێ بەڵام ڕەوشت نا!

خەڵکی لە قیامەت دوورکەوتونەتەوە و ڕوویان لە دنیا کردووە!

مامە ئەوەیە ژیانی شار.

**مامە:** کوڕم خودا بتان پارێزێت.

ئەوەی من لەشاری تێگەشتبم و ئەوەی تۆ دەیڵێیت زۆر گۆڕاوە.

بە پاشکەوتووە, پێشنەکەوتووە!

ژیان تێیدا زۆر قورسبووە!

**من:** وایە مامە، ئامۆژگاریت چیە بۆ من؟

**مامە:** کوڕم کارە باشەکان هەرگیز کۆتایی نایێن!

هەرکەسێک سەرەتا لەخۆی بەرپسیارە، جا هەولبدە تۆ وەک زۆرینە نەبیت، هەوڵی کارە باشەکان بدە، وە بەپێی توانای خۆت دەوروبەرت ڕێنوێنی کاری باش بکە.

**من:** ڕاستە، دەست خۆش مامە گیان.

**ڕونکردنەوە:**

ئەوەی لێرە باسکراوە باسی هەمووکەس نیە، کەسی باش و کاری

باش و خەڵکی زانا هەر ماون، بەڵام کەسانێک هەن بەم شێوەیەن، گرینگ ئەوەیە من و تۆ لەم جۆرانە نەبین، هەموو هەوڵێکمان لە باشە بێت، خراپەکان کاریگەریان لەسەرمان نەبێت، بەڵکو ئێمە پێویستە هەمیشە لە هەوڵ و تێکوشاندا بین بۆ ئەوەی خەڵکی رێنوێنی بکەین بۆ کاری چاکە، زەنگی مەترسیان بۆ لێبدەین لە گوزەرانی ئەمرۆ، کە خەڵکی سەرسامە بە رۆژئاوایەکان لە ژیانیاندا نەوەک لە زانستدا, دەبێ ئێمە هەولبدەین رێرەوی کۆمەڵگا دووبارە بەراوە ئاراستەیەک بگۆرین کە هەموو بەها دینی و ئەخلاقی و پەروەردەیەکان پارێزراوبن، خەڵکی دەست بگرێ بەدینەوە و فەراموشی نەکات.

# قورئان

**باوکم:** السلام علیکم کورِم.

**من:**وعلیکم السلام بابه.

**باوکم:** کورِم چۆنی؟

**من:** سوپاس باشم تۆ چۆنی باوکه؟

**باوکم:** الحمد لله باشم ئیتر بەرەو پیربوونه هەر ئاوا دەبین.

**من:**یاخوا هەر باشبی و بۆمان بمێنی.

**باوکم:** سوپاس کورِم، کورِم بەچی خەریکی ؟

**من:** والله باوکه هیچ, خەریکی تۆرِه کۆمەڵایەتیەکانم.

**باوکم:** کورِم زۆر خۆت بەوه خەریک مەکه.

**من:** ئەی چی بکەم باوکه؟

**باوکم:**کارێک بکه سودی بۆ خۆت و دەورووبەرت هەبێت.

**من:** باوکه کارێکی باشم پێ بسپێره.

باوکم: باشه کورِم، پسیارێکت لێدەکەم و برِۆ بەدوایدا بگەرِێ.

**من:** باشه فەرموو باوکه.

**باوکم:** کورِم دەزانی قورئان چیە وایە؟

**من:** ئەی چۆن باوکە الحمد للّٰه هەر تۆ فێری خوێندنەوەیت کردم.

**باوکم:** الحمد للّٰه کورِم کە دەیزانی بیخوێنیتەوە.

**من:**بەڵێ باوکە.

**باوکم:** بەس شتێکی گرینگ ماوە!

**من:** باوکە ئەو شتە گرینگە چیە؟

**باوکم:** کورِم تێگەیشتنە لە قورئان!

**من:** باوکە جا گرینگە لێی تێبگەی؟

**باوکم:** زۆر گرینگە کورِم زۆر.

**من:** بۆچی بابە ئەوەندە گرینگە ؟

**باوکم:** کورِم برِۆ تا بەیانی بیری لێبکەوە بەشکوم بیزانی بۆچی گرینگە.

**من:** باشە بابە ئەی ئەگەر نەمزانی؟

**باوکم:** من پێتی دەڵێیم إن شاء اللّٰه.

**من:** باشە زۆر سوپاس

# بەشی دووەم

**من:** السلام علیکم باوکە.

**باوکم:** وعلیکم السلام.

**من:** باوکە گیان.

**باوکم:** گیان کوڕی خۆم.

**من:** پسیارەکەی تۆم نەزانی ببورە!

**باوکم:**نا کورِم کێشە نیە.

**من:** دەی باوکە وەڵامەکەیم پێ بڵێ.

**باوکم:** باشە کورِم، پسیارێک؟

**من:** فەرموو.

**باوکم:** لەچەند زمان تێدەگەی؟

**من:** باوکە ئەوە دەزانین کە تەنها کوردی و ئینگلیزی دەزانم.

**باوکم:** باشە، کورِم من دیاریەکم بۆ ئامادەکردوی و لە شوێنێک دامناوە!

**من:** باشە باوکە.

**باوکم:** بەڵام ناونیشانی ئەوشوێنەم بە نوسین بۆ نوسیوی لەم پارچە

کاغەزەدا.

**من:** باشە باوکە گیان بیدە بە من با بیخوێنمەوە.

**باوکم:** فەرموو کورِم.

**من:** باوکە ئەوە بە شێوازێک نوسراوە کە ناتوانم بیخوێنمەوە!

**باوکم:** باشە کورِم ئەوە بە نوسین و زمانی ژاپۆنی نوسراوە.

**من:** بەڵێ.

**باوکم:** من بۆ تۆی دەخوێنمەوە.

**من:** ئێ باوکە ئەگەر تۆش بۆم بخوێنیتەوە من لێی تێناگەم!

**باوکم:** باشە تۆ ئێستا لەوە تێنەگەشتی وایە؟

**من:**بەڵێ راستە.

**باوکم:**چیت زەرەر کرد؟

**من:** باوکە دیاریەکەم زەرەر کرد.

**باوکم:** بۆچی؟

**من:** ئێ باوکە ئەگەر نەزانم چی لێ نوسراوە، من نەشوێنی دەزانم نە ئەو رێگایەش کە بۆی دەڕوات.

**باوکم:** باشە کورِەکەم ئەوە وەڵامی ئەو پسیارە بوو کە دوێنێ لە تۆم پرسی!

**من:** واتا چۆن باوکە؟

**باوکم:** کورِم قورئانی پیرۆز بۆ ئەوە دابەزیوە تا فێرە یەک خوا پەرستیمان بکات، رِێی راستمان پیشان بدات، راست و ناراست لێک جیا بکاتەوە.

**من:** باشە.

**باوکم:** رێگای رازیکردنی الله تعالی مان نیشان دەدات، ئاگەدارمان دەکاتەوە لە سزاو پاداشتی دوارِۆژ(قیامەت)

**من:** باشە باوکە.

**باوکم:** باشە ئەگەر من و تۆ لەم قورئانە پیرۆزە تێنەگەین دەزانین رِێی راست کامەیە ئەگەر بشی خوێنینەوە ؟

**من:** نەخێر.

**باوکم:** کورِم ئەمەش وەکو دیاریەکە وایە، (پێک چواندن نەبێ لە رێزی قورئاندا)ئەگەر لێی تێنەگەی نازانی الله تعالی چیت لێداوا دەکات و رێگری چیت لێدەکات، بەلکو زۆر گرینگتریشە چونکە پەیوەندی بە دوارِۆژتەوە هەیە.

**من:**بەلێ راستە باوکە، بەس ئایا تەنها تێگەیشتن بەسە؟

**باوکم:** ناکورِم نا ئەوە بەشێکی بوو.

**من:** ئەی بەشەکانی تر چین؟

**باوکم:** قورئانی پیرۆز دەبێ بیخوێنیەوە، لێی تێبگەی، کاری پێبکەی،

وەکارکردنەکەش لە پێناو الله تعالی بێ، ئینجا سودی بۆتۆ دەبێ.

**من**: ڕاستدەکەی باوکە گیان زۆر سوپاس بۆ ئەو ئامۆژگاریە باشە و بەسودە.

**باوکم**: دل خۆشبی کوڕم لەسەر خێر و چاکە.

**ڕونکردەوە:**

مەبەست لێرە ئەوەیە، موسڵمانان بزانن و بەئاگا بێنەوە لەگرینگی قورئانی پیرۆز، لە خوێندنەوە و تێگەیشتن و کارپێکردنی، ئەوەی لەم ڕۆژگارەدا دەگوزەرێ، هەمان ئەو گوزەرانە نیە کە ئەوکاتی قورئانی پیرۆز دابەزی، بەڵێ خەڵکی قورئان دەخوێنن، بەڵام تەنها بەسەر زارەکیە، شەیتانەکان و مرۆڤە خراپەکان هەوڵی تێکدانی بیری موسڵمانان و کۆمەڵگایی موسڵمانان دەدەن بە لە بیرکردنی قورئانی پیرۆز لە بیری خەڵکیدا و گرینگی پێنەدانی.

خودای گەورە دیمەنی ڕۆژی قیامەتی بەچەند ئایەتێک خستۆتە بەرچاومان و فەرموویەتی:

(وَيَوْمَ يَعَضُّ الظَّالِمُ عَلَى يَدَيْهِ يَقُولُ يَا لَيْتَنِي اتَّخَذْتُ مَعَ الرَّسُولِ

سَبِيلًا ( 27 ) يَا وَيْلَتَىٰ لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ( 28 ) لَّقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِلْإِنسَانِ خَذُولًا ( 29 ) وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَٰذَا الْقُرْآنَ مَهْجُورًا ( 30 )[30]

واتا: ڕۆژێک دێت ستەمکار قەپ دەکات بەهەردوو دەستی خۆیدا وگاز لە هەردوو دەستی خۆی دەگرێت (لە پەشیمانیدا و) دەڵێت: خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێبازی ئیمانم بگرتایە( 27 ) مەرگ بۆ خۆم، خۆزگە فلان کەسم نەکردایەتە هاوەڵ و دۆستی خۆم (چونکە سەری لێشێواندم). ( 28 ) بەڕاستی گومڕا و وێلی کردم لە بەرنامەی خوا دوای ئەوەی پێم ڕاگەیەنرا بوو، شەیتان هەمیشە و بەردەوام هانی مرۆڤ دەدات بۆ گوناە و تاوان، لەکاتی تەنگانەشدا پشتی بەردەدات. ( 29 ) (دوای دوور کەوتنەوەی ئوممەت لە قورئان) پیغەمبەر صلى الله عليه وسلم سکاڵا دەکات و دەفەرموێت: پەروەردگارا بەڕاستی قەومەکەم وازیان لەم قورئانە هێناوە و پشت گوێیان خستووە و گرنگی پێ نادەن( 30 ).

بۆیە پێویستە ئێمەی موسڵمانان بەئاگا بێینەوە زیاتر گرینگی بە قورئان و تێگەیشتنی بدەین، بەو تێگەیشتنەی پێشینانی ئومەت و زانایانی ئیسلام.

---

[30] الفرقان 27-28-29-30

# لە تاریکایەکانەوە بەرەو ڕۆناکی

**من:** السلام عیکم.

**کابرا:** وعلیکم السلام، بۆکوێ دەچی؟

**من:** دەچم بۆ مزگەوت.

**کابرا:** هههههههه!!!! بۆ کوێ؟

**من:** بۆ مزگەوت.

**کابرا:** چیدەکەی لە مزگەوت؟

**من:** دەچم بۆ نوێژی بە کۆمەل.

**کابرا:** چەندی ماوە بۆ نوێژ؟

**من:** نزیک چل دەقەیەک ماوە.

**کابرا:** ئێ کەمێک وەرە لام دانیشە.

**من:** دەڕۆم درەنگە.

**کابرا:** نانا هێشتان ماویەتی.

**من:** باشە.

**کابرا:** تەمەنت چەندە؟

**من:**بیست سال.

**کابرا:** واو!ھێشتان تازە بەھاری تەمەنتە.

**من:** بەڵێ.

**کابرا:** دەزانی تۆ ھەڵەی؟

**من:** لە چی ھەڵەم؟

**کابرا:**لە بەڕێ کردنی ئەم ژیانەت!

**من:** بۆچی؟

**کابرا:** ئەو تەمەنە و دینداریان نەگوتوە!

**من:** واتا چۆن؟

**کابرا:** تەمەنت بچووکە، واز لەمزگەوت بێنە.

**من:** ئەی چی بکەم؟

**کابرا:** بڕۆ بۆخۆت ڕابوێرە!

**من:** ڕابواردن چیە؟

**کابرا:** ھەرشتێک پێت خۆش بێت!

**من:** واتا چی؟

**کابرا:** گرینگی بەحەز و ئارەزوەکانت بدە!

**من:** دەکرێ ئەوشتە؟

**کابرا:**بەڵێ دەکرێ بۆ نا؟

کاتێک لەتەمەنی تۆدا بووین نەمان دەزانی دینداری چیە و مزگەوت چیە!

**من:** ئێستا چەند ساڵی؟

**کابرا:** لە چل ساڵ لامداوە.

**من:** باشە.

**کابرا:** جا من خەمی تۆمە و تۆش خەمێک لەخۆت بخۆ.

**من:** باشە قسەکانت تەواو بوون؟

**کابرا:** بەڵێ.

**من:** جا ئەگەر ڕێم بدەی منیش هەندێ قسەم هەیە؟

**کابرا:** فەرموو بزانم چی دەڵی.

**من:** ئەگەر تۆ جارێک خەم لەمن بخۆی من ڕۆژانە خەم لە تۆ دەخۆم!

**کابرا:** بۆچی؟

**من:** تۆ چل ساڵە لە ڕێگایەکدایت و بێ ئاگایت لەسەفەرەکەت!

**کابرا:** واتا چی؟

**من:** تۆ کاسەی تەمەنت لە نیوە دەربازی کردووە کەچی هەر لە خەودای.

**کابرا:** ئێ؟

**من:** وا خەریکە موی سپی سەرتاپای ریشت داگیر دەکات هیچی لێ فێرنەبوویت.

**کابرا:** بۆچی ئەو قسانە دەکەی؟

**من:** بۆ ئەوەی کەمێک بەخۆتدا بچیتەوە.

**کابرا:** بۆچی بەخۆمدا بچمەوە؟

**من:** بۆ ئەوەی مردنت بەبیربێتەوە!

**کابرا:** اهم!!

**من:**هیچ بینیوتە لە گۆرستاندا تەمەن نوسرابێ؟

**کابرا:**نەخێر.

**من:** هیچ بینیوتە مردن رەحمی بەکەس کردبێ؟

**کابرا:** نەخێر.

**من:** دەی گەنج زیاتر دەمرێ یان پیر؟

**کابرا:** گەنج!

**من:** بەڵێ، گەر هاتباو گەنج زیاتر نەمردبا، ئەوا دەبوا بەقەد گەنج پیریشمان هەبووایە.

**کابرا:** ڕاستە.

**من:** خەمێک لەخۆت بخۆ تەمەن کەمە، چەند ڕۆژێکە و دێت و دەڕوات، با گرینگی بە ڕۆژێک بدەین کە هیچ شتێک بە کەڵکمان

نایەت تەنها کردەوە چاکەکانمان و دڵێکی ساغ نەبێ و ڕۆیشتنمان بۆ مزگەوت نەبێ، یادی ئەوکەسە نەبێ کەتۆی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون![31]

**کابرا:** زۆر ڕاست دەکەی.

**من:** ببورە کە ئەو قسانەم بەرامبەر بە تۆ کرد، تۆ لە من گەورەتریت، بەڵام ئەو قسانەم بە ئەرک زانیوە.

**کابرا:** نا نا نەخێر، زۆر سوپاس کە منت لەخەوی غەفلەتدا بە ئاگا هێنایەوە.

**من:** یاخوا هەر بەئاگا بیت.

**کابرا:** ئێستا من چیبکەم؟

**من:** وەرە با بڕۆین بۆ مزگەوت.

**کابرا:** من؟

**من:**بەڵێ تۆ.

**کابرا:**زۆر باشە با بڕۆین.

**من:** بانگەکەش تۆ دەیدەیت.

---

[31] يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ( 88 ) إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ( 89 )(الشعراء)
واتا: ئەو ڕۆژەی نە ماڵ سوود دەبەخشێت و (فریای ئادەمیزاد دەکەوێت) نە منداڵ و نەوە.
مەگەر کەسێک بە دڵ و دەروونی پاک و بێگەردو پڕ لە ئیمان، بە خزمەت پەروەردگار گەیشتبێت.

**کابرا:** باشە إن شاء الله.

**من:** الحمد لله نوێژەکەمان کرد.

**کابرا:** بەڵێ الحمد الله، کوڕم ببورە بۆ ئەو قسانەی کە کردم، من زۆر هەڵەبووم.

**من:** کێشە نیە زۆر ئاساییە.

**ڕونکردنەوە:**

مەبەست لێرە چەند خاڵێکە.

**یەکەم**: هەڵە تێگەشتنی خەڵکی لەتەمەن و دینداری و خودا ناسی، لەوەی کە دین تەنها بۆ کەسانی پیر و مامۆستا ئاینیەکانە، ئەوەش هەڵەیەکی گەورە و کوشندەی نێو موسڵمانانە، بەم شێوەیە بەرە بەرە لە دین دادەبڕێن و بەرەو خۆشەوەیستی دنیا دەڕۆن، خۆشیەکانی دنیا و حەز و ئەرەزووەکانیان دەستیان بەسەردا دەگرن، دەبن بە کۆیلەی دەستی گوناهـ و تاوان، کۆمەڵگا بەرەو خراپبوون دەچێ.

**دووەم**: وەرگرتنی ئامۆژگاری ڕاست ئەگەر کەسی ئامۆژگاریکەر ئاستی

زانستی یان تەمەنی لەتۆ بچوکتربێ، مرۆڤ پێویستە هەمیشە دان بە ڕاستیەکاندا بنێت و ئەگەر ئەو ڕاستیە لەهەر شوێنێک یاخود لەلایەن هەر کەسێک پێیبگات.

**سێیەم**: مەرج نیە ئەوکەسەی لە تۆ زیرەکترە و ئاستی زانستی و تەمەنی لەتۆ گەورەتربێ، ئەوا ئامۆژگاریەکانی ڕاستبن، ڕەنگە لەو بوارە دا هەڵەبێ!، دەڵێن هەموو ئەوانەی کە لە دەوروبەرماندا هەن ئامۆژگاریان هەیە بۆمان بەڵام هەموویان سود نا!

# پارە

**هاوڕێ:** السلام علیکم.

**من:** وعلیکم السلام هاوڕێ.

**هاوڕێ:** پسیارێکم هەیە؟

**من:** فەرموو.

**هاوڕێ:** پارە هەموو شتێکە؟

**من:** نەخێر هاوڕێ.

**هاوڕێ:** نەتزانی هاوڕێ.

**من:** بۆچی؟

**هاوڕێ:** چونکە دوێنێ چووم بۆ داخوازی کچێک لەبەر هەژاریم ڕازی نەبوو ژیانی هاوسەریم لەگەڵ پێک بێنێت.

**من:** الحمد للە، تەنیا ئەوەندە؟

**هاوڕێ:** نەخێر.

**من:** چیتر؟

**هاوڕێ:** ئەوڕۆژە لە بازار حەزم بە سەعاتێکی دەست بوو.

**من:** ئێ؟

**هاوڕێ:** بەڵام لەبەر زۆری نرخەکەی نەمتوانی بیکڕم.

**من:** چیتریش؟

**هاوڕێ:** من بە پاس دەچم بۆ زانکۆ هاوڕێکەشم بە سەیارە.

**من:**ئێ؟

**هاوڕێ:**چەند سالە حەزم بە سەفەرێکی دەرەوی وڵات هەیە بەڵام ناتوانم.

**من:** باشە چیتر؟

**هاوڕێ:** هەمیشە ئەو خزمانەی دەوڵەمەندن لە لای خزمەکانی ترم زیاتر لە من ڕێزیان لێ دەگیرێ.

**من:**بەڵێ.

**هاوڕێ:** بێ پارەیی لەزۆر شتی کردم، دڵخۆشیەکانی لێبردووم، منی کردوە بە دیل بە دەستی دنیاوە ژیانم هەمووی لەدوو شتا سەرف کرد.

کارکردن بۆ پارە!

بیرکردنەوە لە پارە!

لەبیرمە لە مەکتەبدا هاوڕێیەکانم گاڵتەیان بە جلی دڕاوم دەهات!

لە هەرکەسێک دەپرسم دەڵێ ژیان بەبێ پارە وەکو زەویەکی بێ ئاوە!

ژیانی بێ پارە وەک ڕێکردنە بەناو دڕک و داڵدا کە هیچت لە پێدا نەبێ!

وەک ڕێکردنە لەشەوا کە هیچ ڕۆناکیەکت پێ نەبێ!

**من:** هاوڕێ ئارامبە و گوێ بگرە.

**هاوڕێ:** باشە.

**من:** پارە هەموو شتێک نیە بەڵام زۆر شتە!

**هاوڕێ:** تۆ هەموو هۆکارەکانی دڵخۆشیت هەیە تەنها پارە نەبێ.

بەڵام تۆ نازانی دڵخۆشبی، دڵخۆشی خۆت بەشتێکەوە بەستۆتەوە کە نیتە .

**هاوڕێ:** چۆن؟

**من:** هاوڕێ کێشەی تۆ بەس پارەیە؟

**هاوڕێ:** بەڵێ.

**من:** باشە، با کەمێک قسە لەسەر ئەوکەسانە بکەین کە پارەیان هەیە و دڵخۆش نین.

**هاوڕێ:** بۆ ئەو جۆرە کەسانە هەیە؟

**من:**بەڵێ هاوڕێ گوێ بگرە.

**هاوڕێ:** باشە.

**من:** هاوڕێ هەرگیز ناتوانێ بە پارە خۆشەویستی بکڕی

هەرکەسێکیش فیزی ئەوە لێبدات کە دەتوانێ بیکڕێت ئەوا سود لەو خۆشەویستیە نابینێت.

**هاوڕێ:** چۆن؟

**من:** هاوڕێ ئەو کچەی کە ڕازی نەبوو هاوسەرگیرت لەگەڵ بکات چونکە تۆ هەژاربوویت ئەوا ئەو تۆی خۆشنەویستوە و ئاشقی پارەیە، ئەگەر تۆ پارەت هەبوایە و هاوسەرگیریتان بکردبا، ئەوا دڵخۆشی هاوسەرگیریتان پەیوەست دەبوو بەئاستی ئابووری بازاڕ هەرکاتێ توشی ئیفلاسی بهاتبا, ژیانی هاوسەرگیریتان لێک هەلدەوەشایەوە، بۆیە لێرەدا سوپاسی خودا بکە کە پارەت نەبووە!

**هاوڕێ:** باشە.

**من:** هاوڕێ هەژاری ئەوە نیە کە نەتوانی سەعاتێکی گران بەها بکڕی, هەژاری ئەوەیە ئاگات لەکات نەبێ و نەزانی چۆن بەڕێوەی ببەی، سودی لێوربگریت بۆ دنیا و دوارۆژت!

**هاوڕێ:**بەڵێ.

**من:** گرینگ نیە بەچی دەچی بۆ زانکۆ گرینگ ئەوەیە لە زانکۆی بە ڕەنج و ماندوبوونی خۆت بەرهەمی خۆت دەدوریتەوە!

**هاوڕێ:** باشە.

**من:** هاوڕێ ئەوە هەژاری نیە تۆ نەتوانی سەفەرێکی دنیایی بکەی لەو

شار بۆ ئەو شار یان لەو وڵات بۆ ئەو وڵات.

ئەوە هەژاریە کە  ئامادە نەبیت بۆ سەفەرێکی کۆتایی کە  بێئاگایت لێی ,ئەویش مردنە!

**هاوڕێ:** وایە.

**من:** هاوڕێ خودی کارکردن دەولەمەندیە کە الله تعالی ئەو توانایەی پێداویت بە هەر شێوازێک بێت لە شێوازەکان تا بتوانی کاربکەیت.

**هاوڕێ:** ڕاستە.

**من:** هاوڕێ ڕێگات بەنوری قورئان ڕۆناک بکە بۆ ئەوەی لەهەرکات و ساتێک دابیت و بەهەر ڕێگایەکدا بڕۆی قورسی و گرانیەکانت لا ئاسان بێت.

**هاوڕێ:** باشە.

**من:** باشە هاوڕێ پسیاری؟

**هاوڕێ:** فەرموو.

**هاوڕێ:** بەڕای تۆ کڕینی سەیارەیەکی مۆدێل بەرز دەتوانێ کوێرێك دڵخۆش بکات؟

**هاوڕێ:**نەخێر.

**من:** دابینکردنی سەفەرێک بۆ دەرەوەی وڵات بۆ دوو هاوسەر کە کێشەی خێزانیان هەبێ دەتوانێ دڵخۆشیان بکات؟

**هاوڕێ:** نەخێر.

**من:** هاوڕێ پارە گرینگە، ڕێگایەکە بۆ بۆ باشتربوونی ژیان لە هەندێك کاتدا، بەڵام ئەوەی هەڵەیە خەڵکی ئەو واقیعە هەڵەی ئێستا و ڕاستیەکان لێک جیا ناکەنەوە،

پێشتر پارە گرینگ بو بۆ ژیان ئێستا ژیان گرینگە بۆ پارە!

بۆیە هەرگیز خۆشیەکانت بە پارە مەبەستەوە،

هەمیشە بیر لە نەبوونی ئەوشتانە بکەوە کە ئێستا هەتە، ئینجا دەزانی چ خۆش بەختێکت هەیە و لێی بێئاگایت.

**هاوڕێ:**ڕاستە هاوڕێ گیان سوپاس.

# خوێندن بۆ پارە یان پارە بۆ خوێندن؟

**من:** السلام عليكم مامۆستا.

**مامۆستا:** وعليكم السلام.

**من:** چۆنی مامۆستا؟

**مامۆستا:** باشم، تۆ چۆنی کوڕم؟

**من:** سوپاس مامۆستا باشم.

**مامۆستا:**لەگەڵ خوێندنت چۆنی؟

**من:** باشم مامۆستا، بەس هەندێك کێشەم هەیە.

**مامۆستا:**چیە کوڕم خۆ شتێکی خراپ نەبووە؟

**من:** نا مامۆستا تەنها لە شتێک تێناگەم!

**مامۆستا:**لە چی تێناگەی؟

**من:** مامۆستا ئایا خوێندن بۆ پارە گرینگە یان پارە بۆ خوێندن گرینگە؟

**مامۆستا:** بۆچی ئەو پسیارەت کرد؟

**من:** چونکە ئالۆزیێکی زۆر لەناو خەڵکدا دەبینم!

**مامۆستا:** چ ئاڵۆزیەک؟

**من:**خەڵکی بوون بەچەند بەرەیەک.

**مامۆستا:** ئێ؟

**من:** هەندێک پارەیان لا گرینگترە,هەندێکیان خوێندن!

هەندێک هەردووکیان بە پێویست دەزانن!

هەندێکیان هیچ کامییان!

هەرکەسێک بە شتێکیان دەبەستێتەوە!

**مامۆستا:** باشە کورم باش گوێ بگرە.

**من:** باشە مامۆستا.

**مامۆستا:**زۆرێک لە شتەکان گرینگیان هەیەلە ژیان.

**من:** واتا چۆن مامۆستا؟

**مامۆستا:** هەندێ شت گرینگە لە ژیان لێی دووربکەویتەوە،

هەندێکی پێویستە لێی نزیک ببیتەوە،

وە هێندێکیش پێویستە هەوڵی بەدەست هێنانی بدەیت،

هنێدێکیش پێویستە بە پێی پێویست مامەڵەی لەگەڵدا بکەی.

**من:** باشە مامۆستا.

**مامۆستا:** با جارێ وازلە پسیارەکەت بێنین.

**من:** باشە مامۆستا.

**مامۆستا:** بابزانین لە ڕاستیدا پارە و خوێندن چین.

**من:** باشە مامۆستا پارە و خوێندن چین؟

**مامۆستا:** کوڕم دوو پێویستی ژیانن و لە هەمان کاتیشدا دوو بەڵای ژیانن!

**من:**واتا چۆن مامۆستا؟

**مامۆستا:** بۆ ئەوەی بەڵا نەبن بۆتۆ لە ژیان دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی کە چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەیت.

**من:** باشە مامۆستا.

**مامۆستا:** هەبوونی پارە ڕێگایەکە ژیانت بۆ ئاسانتر دەکات لە زۆر کاتدا.

**من:** باشە مامۆستا.

**مامۆستا:** بەڵام بە هەبوونی و نەبوونی یان کەمی و زۆری پارە ژیان هەر بەڕێ دەکرێت!

**من:** بەڵێ.

**مامۆستا:** بەڵام خوێندن و زانین ڕێگان بۆتێگەیشتن لە ژیان و مانای ژیان، بە بێ خوێندن و زانین زۆر شت لە دەست دەدەیت!

**من:**وەکو چی؟

**مامۆستا:** ناسینی خودای گەورە بە زانینەوە!

ڕێگایە ئاسانەکانی دڵخۆشی!

**من:**مامۆستا ژیان بەبێ زانین واتا چی؟

**مامۆستا:** واتا ژیان بەڕێکردن لە خەوی غەفەڵتدا!

**من:** مامۆستا کامییان بۆ کامییان پێویستن؟

**مامۆستا:** هەردووکیان دەبن بەبێ یەکتر.

بەڵام هەبوونی هەرکامێکیان ئەوەی تریان ئاسانتر دەکات.

**من:** باشە مامۆستا ئەگەر پێت بڵێم یەکێکیان هەڵبژێرە کامەیان هەڵدەبژێریت؟

**مامۆستا:** خوێندن و زانین!

**من:** بۆچی؟

**مامۆستا:** چونکە هەبوونی پارە ژیان ئاسنتر دەکات

ئەی نەبوونی؟

**من:**مامۆستا ژیان قورستر دەکات.

**مامۆستا:** باشە بە ژیانێکی قورس ڕازیم بەڵام هەرگیز ڕازی نیم ژیانم بە کوێری بەسەر ببەم و لەخەوی غەفلەتدا دابم.

**من:** باشە مامۆستا، بۆچی باسی خوێندن و زانیت بە یێکەوە دەکرد, هەردووکیان یەک شت نین؟

**مامۆستا:** نەخێر کوڕم.

**من:** جیاوازیان چیە؟

**مامۆستا:** هەموو ئەوانەی دەخوێنن مەرج نیە بزانن و زانیاریان هەبێ!

وە هەموو ئەوانەی دەزانن مەرج نیە بخوێنن!

**من:** کەواتە زانین گرینگترە؟

**مامۆستا:** بەڵێ.

**من:** باشە مامۆستا زانین چیە واتا چی بزانن؟

**مامۆستا:** کورِم ئامانجی ژیان بزانن زانستی بەسود بزانن بزانن ئەو زانستەش چۆن بەکار بهێنن.

**من:** باشە مامۆستا زۆر سوپاس.

**مامۆستا:** سەرکەوتووبی.

# نەزانێکی خەمخۆر یان زانایێکی کەمتەرخەم؟

**هاوڕێ:** السلام علیکم.

**من:** وعلیکم السلام.

**هاوڕێ:**چۆنی؟

**من:** باشم سوپاس، تۆ باشی؟

**هاوڕێ:** باشم سوپاس، هاوڕێ پسیارێکم هەیە؟

**من:** فەرموو.

**هاوڕێ:** ئایا زانایەکی کەمتەرخەم باشترە یان نەزانێکی خەمخۆر؟

**من:** نازانم.

**هاوڕێ:** چۆن نازانی ؟

**من:** هاوڕێ تۆ دەیزانی؟

**هاوڕێ:** بەڵێ بەڕای من نەزانێکی خەمخۆر باشترە.

**من:** بۆچی؟

**هاوڕێ:**ئێ مرۆڤ پێویستە خەمخۆر بێت، کە خەمخۆر بێت وە هەست بە بەرپسیارەتی بکات ئەوا کەسێکی باشە.

**من:** هاورێ پەلەی لێ مەکە!

**هاورێ:** ئەی چی بکەین هەر ئاوایە.

**من:** نەخێر هاورێ وا نیە.

**هاورێ:** ئەی چۆنە ؟

**من:** با بڕۆین بپرسین بزانین کامیان باشترە؟

**هاورێ:** لە کێ بپرسین ؟

**من:**لە مامۆستاکەمان.

**هاورێ:** باشە با بڕۆین.

# بەشی دووەم

**من:** السلام علیکم مامۆستا.

**مامۆستا:** وعلیکم السلام.

**من:** باشی مامۆستا؟

**مامۆستا:** باشم سوپاس بۆ خوا، سەلامەت بن.

**من:**مامۆستا من ئەم هاوڕێیە پسیارێکمان هەیە؟

**مامۆستا:** بپرسن کوڕینە.

**من:**مامۆستا ئایا زانایەکی کەمتەرخەم باشترە یان نەزانێکی خەمخۆر؟

**مامۆستا:** کوڕم وا هەست دەکەم پسیارەکە کەمێک هەڵە بێت!

**من:** واتا چۆن مامۆستا؟

**مامۆستا:** واتا لە نێوان دوو خراپەدا ناتوانی بڵێی ئەوە باشترە.

**من:**مامۆستا واتا هەردووکیان خراپن؟

**مامۆستا:**گوێ بگرن کوڕینە.

**ئێمە:** باشە مامۆستا.

**مامۆستا:**لە ڕاستیدا دوو شت لە ژیاندا گرینگە؟

**من:**ئەو دوو شتە چین مامۆستا؟

**مامۆستا:** زانینی ڕاستیەکان!ڕازیبوون پێی و کارکردن بۆی!

**من:**واتا چۆن مامۆستا؟

**مامۆستا:**کوڕم ئەگەرهاتوو زانایەکی کەمتەرخەم بیت واتا ڕاستیەکان دەزانی بەڵام بە دوای ڕاستیەکان نەکەوتووی, لاتداوە لێی و کاریان بۆ ناکەیت, کەمتەرخەمیت لە ئەرکەکەتدا دەکەی!

**من:** واتا؟

**مامۆستا:**واتا زانایەکی کەمتەرەم باش نیە.

**ئێمە:** باشە مامۆستا.

**مامۆستا:**ئەگەر هاتوو نەزانێکی خەمخۆر بیت واتا کار دەکەی و بەدوای شتدا دەڕۆیت و هەوڵ و کۆشش دەکەیت بەڵام بە ڕێگایەکی هەڵە، کە ئەو هەوڵ و کۆششە زیانت پێ دەگەیەنێت نەک قازانج چونکە ڕاستیەکان نازانی!

**هاوڕێ:** باشە مامۆستا.ئەی کێ باشە؟

**مامۆستا:**دەبێ زانا بیت و خەمخۆریش بیت.

**من:** مامۆستا دەتوانی بە نموونە بۆمانی ڕونبکەیتەوە؟

**مامۆستا:**باشە کوڕم . بۆ نموونە لە دیندا چوار جۆرە کەسمان هەیە.

**من:** باشە مامۆستا.

**مامۆستا:**یەکێکیان نە (دیندارە)[32] نە زانا!

یەکێکیان زانایە بەڵام دیندار نیە!

یەکێکیان دیندارە و زانا نیە!

یەکێکیان زانایە و دینداریشە!

**ئێمە:** باشە مامۆستا.

**مامۆستا:** جۆری یەکەم کە نە زانایە و نە دیندار ئیتر پەیوەندیەکی بە دینەوە نەماوە!

جۆرکەی تر کە زانایە بەڵام دیندار نیە، واتا دەزانێ نوێژ واجبە و لە چۆنیەتی کردنی نوێژیش دەزانی بەڵام نایکات!

وە جۆرکەی تریان دینداری دەکات بەڵام هەمووی هەڵەی تێدایە و خۆی فێری زانستی شەرعی نەکردوە ,لەوانەیە گومرا بێ!

**من:** ئەی جۆرەکەی تر؟

**مامۆستا:** جۆرە باشەکە ئەوەیە کە زانا بیت و دیندار بیت، واتا دەزانێ نوێژ چیە چۆنە وە دەشیکات.

دەزانێ هیچ ڕێبازێکیتر دروست نیە جگە لە ئیسلام بۆیە تەنها بە ئیسلام ڕازیدەبێت.

کار بۆ ڕازیکردنی خوا دەکات نەوەک بەندەکانی،

---

[32] دیندار واتا : کەسێک فەرزەکان جێبەجێ بکات

ئەوەیە نموونەکە.

**من:**بەڵێ مامۆستا زۆر ڕاستە دەستت خۆشبێ.

**مامۆستا:** سەرکەوتووبن.

**من:**هاوڕێ ئێستا زانیت چۆنە؟

**هاوڕێ:**بەڵێ من پەلەمکرد لە بڕیاردان، ڕاستیەکەم نەزانی.

**من:** باشە هاوڕێ کەواتە جارێکیتر پەلە لە هیچ کارێک و بڕیارێکدا مەکە.

**هاوڕێ:** باشە هاوڕێگیان, زۆر سوپاس.

# پیری یان گەنجی؟

**من:** السلام علیکم باپیرە.

**باپیرە:** وعلیکم السلام کورِم.

**من:** باپیرە گیان چۆنی؟

**باپیرە:** باشم الحمد للە کورِم.

**من:** باپیرە پسیارێکم هەیە؟

**باپیرە:** فەرموو کورِم.

**من:** باپیرە پیری یان گەنجی؟

**باپیرە:** تەندروستی کورِم!

**من:** مەبەستت چیە باپیرە؟

**باپیرە:** کورِم مەبەستم ڕوونە!

**من:** من تێی ناگەم, وەڵامەکەت جیاوازبوو.

**باپیرە:** کورِم چ گەنج بی چ پیرا

چ جوان بی چ ناشرین!

بەهێز بی یان بێهێزا

ماڵت هەبێ یاخود نا

هەر پێویستت بە تەندروستیە!

**من:** باشە باپیرە کەواتە جیاوازی نیە لە نێوان پیر و گەنج؟

**باپیرە:** نەخێر کوڕم، جیاوازی زۆرە!

**من:** ئەم جیاوازیە چۆنە؟

**باپیرە:** کوڕم ژیانی مرۆڤ لە بێهێزیەوە دەست پێدەکات تاوەکو لوتکەی بەهێزی, دواتر بەرە بەرە بەرەو لاوازبوون دەڕوات.

**من:** باشە.

**باپیرە:** کوڕم لەهەر سات و کاتێکی ژیانتدا بیت ,گەر تەندروستییێکی باشت هەبێت ئەوا دەتوانی ئەو ئەرکەی لەسەر شانت دایە جێبەجێ بکەیت.

**من:** ئەی باپیرە ئەگەر بڵێم لە تەندروستییێکی باش پیری یاخود گەنجی ؟

**باپیرە:** لێرە گەنجی کوڕم.

**من:** بۆچی باپیرە؟

**باپیرە:** کوڕم چونکە لە گەنجی دا ژیان لەژێردەستی تۆیە بەڵام لە پیریدا تۆ لەژێر دەستی ی ژیان دایت!

گەنج توانایی زیاترە!

گەنج دەتوانی فێرببێت!

گەنج دەتوانێ بیر لە داهێنان بکاتەوە!

گەنج دەتوانی بیێ بەسەرکردە!

گەنج دەتوانی ئەوشتانە بکات کە نەکراون!

گەنج توانایەکی ناوەکیی بەهێزی هەیە!

گەنج دەتوانێ بەرانبەر کێشەکان بوەستێ!

گەنج دەتوانی سەرکەوتووبێ!

پێشکەوتن لەدەست گەنجە!

هەرشتێ پێویست بوو بۆ باشی مرۆڤ لەگەنجدا هەیە!

**من:** باپیرە گەنج ئاوا بەهێزە؟!

**باپیرە:** زۆر لەوە زیاتریش کورم!

**باپیرە:** ئەی بۆ ئەوە لە گەنجەکانماندا نابینم؟

**باپیرە:** کورم چونکە گەنجەکانمان رۆڵی گەنجیان لەدەست داوە!

**من:** واتا چۆن؟

**باپیرە:** کورم گەنج هۆشیاری زۆر کەمە، بۆیە بیری گەنجیان گۆڕیوە!

**من:** چیان لە گەنج کردووە؟

**باپیرە:** وایان لێکردوە ژیانیان خۆشبوێت و بیرلە مردن نەکەنەوە!

هەمیشە بێ پلان بێ!

کاتی زۆری هەیە و لەهەمان کاتدا بێ کاتە!

داوای ماف دەکەن نەک ئەرک!

خوێندیان لاگرینگترە لە خوێندەوە!

بیر لە بڕوانامە دەکەنەوە نەوەک فێربوون!

قیەم و بەهایان لا گرینگ نەماوە!

**من:** باپیرە گەنج چۆن وابکات ئەرکی گەنجایەتی جێبەجێبکات؟

**باپیرە:** بیری چاک بکات، هەموو ئەو هەڵانەی باسمان کرد ڕاستیان بکاتەوە.

**من:** جا ئەوە ئاسانە؟

**باپیرە:**بەڵێ کوڕم.

**من:**بۆ چ کەسێک ئاسانە؟

**باپیرە:**بۆ ئەو کەسەی کە بیەوێت!

**من:** ڕاستە باپیرە گیان، زۆر سوپاس.

**پابیرە:** تەمەن درێژبیت کوڕی خۆم.

# دین و پێکهێنانی ڕای دروست

**هاوڕێ** :السلام علیکم.

**من:** وعلیکم السلام هاوڕێ.

**هاوڕێ:** چۆنی؟

**من:** باشم الحمدلله تۆچۆنی؟

**هاوڕێ:** باشم سوپاس،

هاوڕێ گیان پسیارێکم هەیە.

**من** :فەرمووگیان.

**هاوڕێ** :دین چیە؟

**من** :هەر کەسێک و هەر تاقم و گروپێک لە هەر ڕێبازێک پێناسەی دین بە جیادەکان.

**هاوڕێ** :باشە تۆ بەکام مانا وەرتگرتووە؟

**من** :من بە مانای تێگەیشتنی ئیسلام و پێناسەی ئیسلام بۆ دین وەرمگرتووە.

**هاوڕێ** :باشە لەم ڕوانگەیەوە باسم بۆ بکە.

**من** :باشە بەمانا کورت و پوختەکەی، دین واتا

ملکەچ بوون و کارپێکردن وخۆش ویستنی ئەو بەرنامەی کە الله تعالی ناردوویەتی بۆمان.

**هاوڕێ** :باشە سودی دین چیە؟

**من** :بە گشتیەکەی دین پێنج سودی هەیە.

**هاوڕێ** :سودەکانی چین؟

**من** :یەکەمیان: پاراستنی دوارۆژ و قیامەتی مرۆڤ.

دووەمیان: پاراستنی ژیان و بوونی مرۆڤ.

سێیەمیان:پاراستنی ئەقلی مرۆڤ.

چوارەمیان:پاراستنی ناموس و شەرەفی مرۆڤ.

پێنجەمیان:پاراستنی ماڵ و پارە و سامانی مرۆڤ.

**هاوڕێ** :باشە .

**من** :پەیوەستبوون بە دینی ئیسلام وادەکات اللهتعالی لێت ڕازی بێت، چونکە دینی پەسەند و تەواولای الله تعالی تەنها ئیسلامە.

**هاوڕێ** :باشە دین دەتوانێ چیتر بکات؟

**من** :جگە لە ڕازیکردنی پەروەردگارلە بەندەکانی گرینگ یێکی زۆر بە کۆمەڵگا دەدات.

**هاوڕێ** :واتا چۆن؟

**من** :واتا ئەگەر سەیری دینی ئیسلام بکەین و سەرچاوەکانی بخوێنینەوە کە قورئان و فەرموودەن.

**هاوڕێ** :بەڵێ.

**من** :دەبینین هەرشتێک فەرمانی لە سەر بێت کۆمەڵگا پێی ئارامتر دەبێت و هەرشتێکیش ڕێگری لێکرابێت لە سودی کۆمەڵگادایە.

**هاوڕێ** :باشە دینی ئیسلام دەتوانێ یەک ڕای بێنێتە بوون؟

**من** :بەڵی، بەڵام دەبێت لە جۆرەکانی ڕا تێبگەین!

**هاوڕێ** :باشە جۆرەکانی ڕا چین؟

**من** :جۆرێکیان هەیە کەڕا جیاوازیە، هیچ کێشەیێک تێیدا نیە، بەڵکو هۆکاری بەردەوامبونی ژیانن.

**هاوڕێ** :واتا چۆن؟

**من**:واتا بۆ نموونە هەر کەسێک شوێنێکی پێخۆشە و هەر کەسێک خواردنێک، جۆرە ڕەنگێک و جۆرە جلێک، کە هیچ پێویست ناکات یەک ڕای هەبێت لەم بوارانەدا.

**هاوڕێ** :باشە.

**من** :جۆری دووەمیان ئەوەیە کە پێویستە یەک ڕای تێیدا هەبێت بۆ باشتربوونی کۆمەڵگا، وە لەم بوارانەدا دین توانیویەتی یەکڕای دروستبکات، گەرهەموومان بۆ سەرچاوەکانی دین بگەڕێینەوە.

**هاوڕێ** :واتا؟

**من** :واتا دەبێ هەموو موسڵمانان هاوڕابن کە درۆکردن شتێکی خراپە و نابێ بکرێت!

هەموو موسڵمانان هاوڕابن کە پێویستە یارمەتی هەژاران بدرێت!

هەموو موسڵمانان هاوڕابن کە خۆشەویستی نێوانیان لە هەموو شتێک زیاتربێت!

هەموو موسڵمانان هاوڕابن کە نابێ هیچ هاوتا و هاوەڵێک بۆ الله تعالی بڕیار بدرێت.

**هاوڕێ** :باشە.

**من** :گەر بێت و سەیری ڕابردوو بکەین دەبینین کە ئیسلام توانیویەتی کۆمەڵگا بە باشترین شێوە پەروەردە بکات، وە دوور بێت لە هەموو ئەو کێشانەی کە ئەمڕۆ پێوەی دەناڵێنین.

**هاوڕێ** :ڕاستە، شتەکە ڕوون بوو، دەستخۆش هاوڕێ.

# دوو دیداری جیاواز

**هاوڕێ**:السلام علیکم.

**من** :وعلیکم السلام.

**هاوڕێ** :چۆنی؟

**من** :باشم سوپاس بۆ خوا، تۆچۆنی؟

**هاوڕێ** :باشم سوپاس بۆ خوا.

**من** :هەرباشبی.

**هاوڕێ** :سوپاس هاوڕێ، ئەم ڕۆژە گوێم لە شتێک بوو لە مەبەستی تێنەگەشتم.

**من** :ئەو شتە چیە؟

**هاوڕێ** :باسی ژیانی دەکرد.

**من** :واتا چۆن؟

**هاوڕێ** :باسی ئەوەی دەکرد کە ژیان دوو دیدی جیاوازی هەیە!

**من** :بەڵی .

**هاوڕێ** :بەس من نەمزانی مەبەست لە دوو دیدی جیاواز لە ژیاندا چیە؟

بۆچی ژیان دوو دیدی جیاوازی هەیە؟

**من** :باشە هاورێ، که باسی ژیان دەکەین واتا باسی ژیانی مرۆڤ دەکەین لە دنیادا.

**هاورێ** :باشە.

**من** :بەڵێ هاورێ بۆ هەر کەسێکمان دیدێک لەژیان هەیە.

**هاورێ** :باشە.

**من** :بەڵام لەڕاستیدا مرۆڤایەتی دوو دیدی جیاوازی هەیە.

**هاورێ** :واتا چۆن؟

**من**:کاتێ سەیری دنیا دەکەین دەبینین کەسانێک هە ن لە جەنگدان و کەسانێک لە ئاشتی!

**هاورێ** :باشە.

**من** :کەسانێک هەن لە تەندروستی خراپدان و کەسانێکیش لە تەندروستی باش!

کەسانێک لە برسیەتی و کەسانێک لە تێریدا!

کەسانێک لە ئاوارەیدا و کەسانێکیش لە ماڵ و جێگای خۆیان!

کەسانێک لە ئومێد و کەسانێکیش لە بێ ئومێدی!

کەسانێک لە دەوڵەمەندی و کەسانێکیش لە هەژاریدا!

کەسانێک لەغەفڵەت و کەسانێکیش لە هۆشیاریدا!

کەسانێک لە تاریکی و کەسانێکیش لە ڕۆناکیدا!

کەسانێک لە ژیانی تەنیای و کەسانێکیش لە نێو خەڵیکدا!

کەسانێک دەسەڵاتدار و کەسانێکیش بێ دەسەڵات!

کەسانێک ستەمکار و کەسانێکیش ستەم لێکراو!

کەسانێکی خاوەن کار و کەسانێکیش بێکار!

کەسانێک خوێندەوار و کەسانێکیش نە خوێندەوار!

کەسانێک دڵ ناسک و کەسانێکیش دڵ ڕەق!

کەسانێک ئیماندار و کەسانێکیش بێ باوەڕ!

**هاوڕێ** :باشە.

**من** :هاوڕێ ئەوانە دوو دیدی جیاوازن لە ژیانی مرۆڤە جیاوازەکاندا هەستی پێدەکەین.

**هاوڕێ** :بەڵێ.

**من** :بەڵام هەر مرۆڤێک دیدێکی جیاوازی هەیە لە ژیاندا و ناتوانێ دوو دید لە هەمان ڕەوشتدا لەخۆی زاڵ بکات.

**هاوڕێ** :ئەمە واتای چیە؟

**من** :هەر مرۆڤێکی خوێندەوار ناتوانێت نە خوێندەوار بێت!

کەسێکی دڵ ناسک ناتوانێت دڵ ڕەق بێت!

وە کەسێکی ئیمانداریش ناتوانێت لە هەمان کاتدا بێ ئیمان بێت.

**هاوڕێ** :باشە.

**من** :هەر یەکێک لە مانەش بە جۆرە دیدێک ژیان بەڕێ دەکەن.

**هاوڕێ** :باشە.

**من**:هەرگیز دوو ڕەوشت لە یەکشت دا لە مرۆڤێکدا کۆ نابێتەوە.

**هاوڕێ** :بەڵێ، ئەی ئەم دیدانە بەدەست مرۆڤن، یاخود بەدەست شتانی تر؟

**من** :لێرەشدا جیاوازی هەیە

**هاوڕێ** :چۆن؟

**من** :هەندێک لەم دیدانە بەدەستی مرۆڤن و هەندێکیان نا.

**هاوڕێ** :بۆ نمونە؟

**من** :باشە، هەموو ئەو منداڵانەی کە قوربانی دەستی ڕژێمە دیکتاتۆرەکانن و یاریکردنیان لە پاشماوەی جەنگە ئەوانە قوربانین و حەزیان بەم دیدە نیە، بەڵام ژیانێکە بەسەریاندا سەپێندراوە و بە دەست خۆیان نیە.

**هاوڕێ** :باشە ئەی چ دیدێك بە دەستی مرۆڤ خۆیەتی؟

**من** :دیدی کوفر و ئیمان.

**هاوڕێ** :واتا؟

**من** :واتا هەر مرۆڤێک لە هەر ژینگەیەکدا بێت و لە هەر کوێدا بژیت وە چۆن بژیت، هەڵبژاردنی کوفر و ئیمان بە دەست خۆیەتی و خۆی لە دیاریکردنی بەرپسیارە و لە دوارۆژدا چی هەڵبژاردوە هەر بەوەش لێ پرسینەوەی لە گەڵدا دەکرێت.

**هاوڕێ** :زۆر ڕاستە، ئامۆژگاریت چیە؟

**من** :مرۆڤ پێویستە بزانێت لە کوێدایە و چ دیدێکی هەڵبژاردوە، وە جیاوازی بکات لەنێوان دیدەکاندا.

**هاوڕێ** :واتا چۆن جیاوازی بکات؟

**من** :دیدێک کە خۆی لێی بەرپسیارە لە هەڵبژاردنی نەکاتە قوربانی بۆ دیدێک کە بە دەست خۆی نیە،

واتا دەوڵەمەند بێ یان هەژار،

بە دەسەڵات بێ یان بێ دەسەڵات،

پیربێ یاخود گەنج،

ڕێگر نیە لەوەی کە موسڵمانی یان بێباوەڕ.

**هاوڕێ** :وایە زۆر ڕاستە، دەستخۆش هاوڕێ گیان.

# گریان و پێکەنین

**هاوڕێ**: السلام علیکم.

**من**: وعلیکم السلام.

**هاوڕێ**:چۆنی؟

**من**: باشم تۆ، چۆنی؟

**هاوڕێ**: سوپاس بۆ خودا باشم.

**من**: یاخودا باشبیت.

**هاوڕێ**: هاوڕێ پسیاری؟

**من**: فەرموو.

**هاوڕێ**:دوو شت کەم تا زۆر لە خەڵکیدا هەیە،

هەموو خەڵکی دەزانن چیە و هیچیشی لێ تێناگەن!

**من**: ئەو شتانە چین ؟

**هاوڕێ**: گریان و پێکەنین

**من**: باشە

**هاوڕێ:** با لە تۆی بپرسم گریان و پێکەنین چین ؟

**من:** لە ڕوی واتاداریەوە دوو وشەی پڕمانان

**هاوڕێ:** باشە

ئایە دژی یەکن ؟

**من:** نەخێر هەرگیز لێک جودا نین.

**هاوڕێ:** گریان یان پێکەنین؟

**من:** دوو پێویستی ژیانن، زۆر سودیان بە مرۆڤایەتی گەیاندووە.

**هاوڕێ:** لە هەموو کاتێکدا گریان و پێکەنین ئاساین؟

**من:**بەڵێ ئاساین، بەلام وا باشە لەگەل ژینگەی دەوروبەرتدا بگونجێ،

وەکو گریان لە تانیایی و پێکەنینیش لە نێو خەلک

**هاوڕێ:** چ شتێکی گریان و پێکەنین جوانە؟

**من:** ئەو کاتەی ئاوێتەی یەکتر دەبن، ڕوخسار دەبێ بە ڕۆمانێک و تێگەیشتن لێی قورس دەبێ.

**هاوڕێ:** کات بەسەربردن لەگەل کامیان خۆشترە؟

**من:** شەوانە گەر تەنها بیت گریان!

**هاوڕێ:** بۆچی

**من:** بۆ ئەوەی ڕۆژەکەی بە دەرونێکی ئارامەوە پێبکەنم.

**هاوڕێ**: پێویستە گریان و پێکەنین چۆن بن؟

**من**: گریان بە خوڕ، پێکەنین بە زەردەخەنە!

**هاوڕێ**: گریان و پێکەنین چی بە مرۆڤ دەبەخشن؟

**من**: زۆر شت.

**هاوڕێ**: وەکو؟

**من**:پێویستە گریان و پێکەنینمان بێ ئامانج نەبێ، ئینجا دەستکەوتمان دەبێ.

**هاوڕێ**: باشە

**من**: ئەگەر گریان و پێکەنین لەپێناو خودای گەورەبێ ئەوا گریانەکەی دەرونێکی ئارامت پێ دەدات،

دڵت پاک دەبێتەوە لە چڵکی گوناهـ و تاوان.

**هاوڕێ**: ئەی پێکەنین؟

**من**:هەر کاتێک بە ڕووی بەرامبەردا پێبکەنی و ئەو پێکەنینە ڕێگە پێدراو بوو ئەوا چاکەت بۆ دەنوسرێت لە کتێبی کارەکانتدا، خۆشەویستت دەکات.

**هاوڕێ**: باشە.

**من**: بەڵام هەرگیز بە خەڵک پێمەکەنە بەڵکو بۆیان پێبکەنە!

**هاوڕێ**: هۆکارەکانی گریان و پێکەنین چین؟

**من**: نەزانراوە !

نە گریان مانای دڵ تەنگیە و نە پێکەنین مانای دڵ خۆشی!

زۆرمان بینیوە دڵ خۆشە کەچی دەگری، دڵ تەنگە و پێدەکەنێ!

هیچ کەس ناتوانێ شرۆڤەی کامیانم بۆ بکات.

**هاوڕێ**: چی لە گریان و پێکەنین بکەین؟

**من**:هاوسەنگی نێوانیان ڕابگرە.

**هاوڕێ**:باشە،

**من**:هەرکاتێک توانیت هاوسەنگی نێوان دڵ و گریان و پێکەنین ڕابگریت،

دەتوانی هاوسەنگی ژیان رابگریت،

پێکەنین و گریانە دەبن بە چارەسەر!

دەبن بەخۆشی!

دەبن بە وزە!

دەبنە هۆی پاداشت وەرگرتن!

با گریانەکان ببنە هۆی پاککردنەوەی دڵ و تەڕکردنی بەرماڵەکەت!

**هاوڕێ**: چی بکەین باشە؟

**من**: گریان و پێکەنین بکەن بە خوو، ئەو خوەش بۆ ئامانجێک پەرە پێبدەن!

با پێکەنینەکان ببنە ئارامی دڵ و دڵی هاوسۆزەکەت!

ئەوە گریانە کە وات لێدەکات بێ هیوانەبی لە ژیان!

وە پێکەنینە کە هیوا و ئاواتەکانت لا گەشتر دەکات!

**هاوڕێ**: باشە، جیاوازی لە نێوان ڕەگەزەکان هەیە بۆ گریان و پێکەنین؟

**من**: واهەست دەکەم پێکەنین یەکسان بێت، بەڵام لە کۆمەڵگاکەمدا گریان تەنها بۆ ئافرەت دانراوە!

**هاوڕێ**: جا ئەوە ڕاستە؟

**من**: نەخێر هەڵەیەکی زۆر گەورەیە.

**هاوڕێ**: گەر مرۆڤ لە گریان دووربێت چی بەسەر دێت؟

**من**: دڵ ڕەق دەبێت، سۆز و میهرەبانی بەرەو لەناوچوون دەڕوات!

پیری هەر زوو بەرۆکی دەگرێ، بێبەش دەبێت لە ئارامی.

**هاوڕێ**: ئەی دووری لە پێکەنین ؟

**من**:گۆشەگیر دەبێ!

توشی نەخۆشی دەرونی دەبێت!

**هاوڕێ**: چیبکەین باشە؟

**من**: گریان و پێکەنین بکەن بە خوو ئەو خووەش بۆ ئامانجێک پەرەی پێبدەن.

جەنگی ژیان هەوڵدانە ،
زانینی ڕاستیەکانە ،
کردنی کاری باش و
دورکەوتنەوە لە هەڵەکانە ،
پێکەنین و گریانە ،
سەرکەوتنەکانی گەنجیەتی و
سەنگینی پیرەکانە،
خەیاڵ و دەرونێکی ئارامە ،
ئەوە ژیانە هەندێکجار
دووری و هەندێک جار نزیکی ئازیزانە ،
گرینگ ئەویە بزانە تۆ میوانی لەو جیهانە
کۆتایی میوانیش
هەر دابڕانە،

**ئەنەس هەرکی**

بەرگ : ئیبراهیم سالح



کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ چاپ و بڵاو کردنەوە

07504671394 - 07831734977
فەیس بووک : کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی
هەولێر - پشت قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری ■ نرخ : ٣٠٠٠